نووسینی : عبدالرحیم گرین

وەرگێرانی: شاڵاو کەمال مەلا حوتان

# پێشکەشە بە هەرکەسێك کە عەوداڵی ڕاستیە

# بەندی یەکەم

## گەشتەکە دەستپێکرد

من زۆر دڵنیام کە ئێوە حەز بەم گەشتە ناکەن، ڕەنگە بۆ کەمێکیش حەزی پێ نەکەن. ئەم گەشتە دەربارەی هەموو جۆرێکی هەموو شتێک دەدوێت کە زۆرێك لە ئێمە کاتێکی زۆر سەرف دەکەن بۆ ئەوەی خۆی لێ دوربخەینەوە. وەك مردن! بەڵی، ئەوە ڕاستە، مردن. مردن، دادوەری، دۆزەخ ، بەهەشت ،(یان ئەوە هەمووی کولێرەبە ڕوونێکە لە ئاسمان ؟)، مانای ژیان وە بێگومان ، گەورەترینیان ئەوەیە ،ئایا لە ڕاستیدا خوا هەیە؟ یان ئەمە هەمووی فڕو فێڵە؟ تەنها هەندێک شتن ئەوپەڕی وزەی خۆت بۆ خۆ دورخستنەوە لە بیرکردنەوە دەربارەیان بەکاردێنێ. بەهەرحال ئەمە چ پەیوەندیەکی هەیە بە پیاوە دەرپێ سوورەکە؟

دەمەوێت بۆ گەشتێک لەگەڵم بێیت. گەشتێکی درێژ نیە. بەڵام بە ڕیگایەك ڕووبەڕووی هەندێك بیرۆکەی سەیرو سەمەرە دەبینەوە و دەشێت ترسناک بن، وە ئەو بیرۆکانەی کە تۆ ناتەوێ بڕوای پێ بکەی سەرەڕای ئەوەی کە ماقوولن. هەندێک لە ئێوە تا ئێستاش نیگەرانن، هەندێکیش دایدەنێو تەواوی ناکا ، وە هەندێک لە ئێوە واتان لێ دەکەن لوت بەرز بن و لە ناو فیزا بن، وە ئەمەش زۆر زۆر خەماویە چونکە شتێکتان لە کیس دەچێت کە گرنگترین شتە لە ژیانت. هەندك لە ئێوە هەن هەمووی بخوێنێتەوە ڕەنگە پێی ڕێك بێت و لەگەڵیشی کۆکبێ ، بەلام هەرگیز بۆی ناگەڕێ تا شتێکی دەربارەی بکا، هەردوکیانە هەم بەڕاستی خەمباریە و وە هەم بەڕاستی خراپە. بەهەرحاڵ پێم وتی ئەمە شتی وای تێدا دەبێ تۆ حەزت لێی نیە! بەڵام لە شوێنێک هەندێک لە ئێوە هەمووی تیا دەبیینن. ئینجا کەمێک بیر دەکەیتەوە ، یان زۆر، وە دواتربەڕاستی لەگەڵ ژیانت شتێکی سەرسام دەکەیت، دواتر دەرکەوتوە ناچارەکانی فکر قەبووڵ دەکەی، هەناسەیەکی قوول هەڵکێشە (بەلایەنی کەم هۆشدارانە بێ) وە بڕیاربدە بۆ هەڵگرتنی ڕاسپاردەیەك کەبە ڕێگایەکی نایاب دەتگۆڕێت. وەک ئەوەی کە دیارە ترسناکە، وە جارێك کە دەیکەیت، شتەکان زۆر مەنتقیتر دەبن

با بچینە ناو کرۆکی بابەتەکە. گەشتەکە دەست پێ بکەینو بچینە ناو ماشێنی بیرو هۆشی تەواو.

چی دەکەی ئەگەر پیاوێك بە جووتێك دەرپێی سوورەوە هاتو لە دەرگای ماڵەکەتانی داو بلێت کە ئەو هاتوە بۆ ئەوەی گێچی غازی ماڵتان بخوێنێتەوە؟

بەڵێ، بەڕاستمە، چی دەکەی؟ لە ڕاستی، ئەوەی کە تۆ بەڕاستی دەیکەی زۆر گرنگ نیە لێرە کە چ کردارێك بەکاردێنی وە چ توانایێك بەکاردێنی بۆ ئەوەی بگەیت بە بڕیارێك دەربارەی ئەو پیاوە و داخوازیەکەی.ئایا بێ ئەوەوی بیری لێ بکەیتەوەو بڕوای پێیدەکەی و ڕێی پێ دەدی بێتە مالت؟ تەنها لەبەرئەوەی باوەڕت پێی هەیە؟ یان بیرت لە پارەکە دەکردەوە، هەندێک پرسیارت لێ دەکردو هۆشی خۆت بەکاردەهێنا؟ من دڵنیام کە ئەمە کۆتاییەمینیانە. تەنانەت گەر پێشی بڵێی " لێرە ونبە هەی بێ مێشك". بیرو هۆشی خۆت بەکاردێنی تا هاتنی ئەو پیاوە دەرپێ سوورە بە ماقووڵی دابنێی، تەنها وەک ئەوەی بۆ زۆربەی شتەکان لە ژیانمان دەیکەین.

ئێستا، پێش ئەوەی بچینە پێشتر من دەمەوی لەگەڵم لەسەر شتێك هاودەنگ بی. ئەگەر لەگەڵم هاودەنگ نەبی لەسەری ئەوا هیچ قۆناغیك نیە بۆ چوونە پێشتر. ئێمە دەبێ کۆکبین لەسەرەوەی کە ئەم جیهانەی ئێمە لەسەری ئەژین ڕاستەقینەیە و من و تۆو ئەو هەموو شتانەی دەورو بەرمان بونیان هەیەو ئەو بەرهەمە نیە لە بەرهەمی جیهانێکی خەیاڵاوی کۆمپیوتەربێت، یان خەونێك بێت کە ڕوویدابێتو تۆی تیا بی. ئێستا بەڕاستی ناتوانم بیسەلمێنم، وە لەوانەشە ئەوەی لە دەوروبەرمان دەیبینین خەونێك یان خەیاڵێک بێت بەڵام ئەمە چ یارمەتییێکمان دەدات؟ گەر ئاوا بیربکەینەوە ئەوا ناتوانین هۆشیاربین دەربارەی هەرشتێك، تەنانەت گەر قبوڵیشی بکەین، ئێمە هێشتا بیری خۆمان بەکاردێنین بۆ ئەوەی هۆشداربیین دەربارەی ئەو شتە وە هێشتا دەبێ ئەوە قبوڵ بکەین لە ڕووی هۆشەوە کە ئەوەی دەیبینین ڕاتەقینەیە.

بەم شێوەیە ئەگەر لەگەڵم کۆکی کە ئەم جیهانە ڕاستەقینەیە وە ئەوەی کە دەیبینین، بۆنی دەکەین ، هەستی پێ دەکەین، گوێبیستی دەبینو تامی دەکەین ڕاستەقینەیە. کە هەستەوەرەکانمان زانیاری دەگەیێنن بۆ مێشکمان وە ئێمەش هۆشی خۆمان بەکاردێنین بۆ ئەوەی هۆشیار بیین لەوەی کە چی ڕوو دەدات، ئینجا با ئەم کردارە بەکاربێنین بۆ ئەوەی ئەم ژیان و دونیا و جیهان و هەموو شتێک ژیرانەبێت.

ئیستا هەندێک بنچینەی بیری هەن ئێمە ئەتوانین پێیان بڵێین '' بنچینە گشتیەکان'' چونکە دەربارەی هەموو کەسێکە ئەوەندەی کە ئەیزانین لەسەری کۆکین. لە ڕاستیدا، ئەم بنچینە بیریانە بەشێکن لە بە مرۆڤبوونمان، وە ئەگەرهەچکەسێك پێیان ڕازی نەبێ ئەوا بە شێتیان دادەنێین. بۆ نموونە وتەی " بەشێك لە شتێک کەمترە لە هەمووی".ئەمە گشتیە بۆ هەموو خەڵکە. لەبەر ئەوەشە پێی دەڵێین "ژیری ساغ" . زۆر ئاشکرایە پێویستی بە ڕوونکردنەوە

نیە. لەگەڵم کۆکی تا ئێستا؟باشە. نمونەیەکی تر " شتێک لە هیچەوە پەیدا نابێ" چ دەربارەی "دەستور خۆبەخۆ لە ئاژاوە(فوضی) بەرپانابێت؟"

چی هەیە لە سەرجەمی زانیاریکانی مرۆڤ کە ڕێنموییمان دەکات بۆ وەی باوەڕبکەین کە شتێک لە هیچەوە پەیدا نابێ یان فەرمان خۆبەخۆ لە ئاژاوە بەرپانابێت؟

بەڵێ ئەمە ڕاستە! هیچ شتێك. لە ڕاستی ئەوەی کە ئێمە هەوڵی بۆ دەدەین ئەوەیە کە دەستور و ئەندازە و سیستەمێک هەیە، زاتێک ئەم دەستورو ئەندازە و سیستەمەی سەپاندوە، تاکوو سیستەمەکە ئاڵۆزتر و ڕێکوپێکتربێت وەتاکوو ئەندازەکە کرداریتربێت ، ئاستێکی زیرەکی گەورەتری بەدواوەیە.

دوو ڕاستی هەن دەتوانین بەکاریانبێنین بۆ ئەوەی ئەم دونیایە لەلامان ماقوڵبێت ، جیهان و ژیان. شارەزایی مرۆڤە جیهانیەکان پێماندەڵێ کاتێک ئێمە شتەکان دەدۆزینەوە کاردەکەن ئەو کارکردنەش دەگەڕیتەوە بۆ هەبوونی سیستەم و یاساو شێوازەکان. لەبەرئەوەشە کاتێک کە پسپۆڕێکی شوێنەوارناسی پارچەیەک شعر لە سەر زەوی دەدۆزێتەوە ئەوا بە دڵنیایەوە ئەزانێت کە کۆمەڵە خەڵکێك ئەم شعرەیان نوسیوە کە هەرگیز نەشیبینون. ڕەنگە بشتوانێ هەموو بواری شتەکانی ئەو خەڵکانەمان پێ بڵێ لە ڕووی شارستانی و باری تەکنەلۆجی تەنها لەڕێی ئەو پارچە شعرەوە. شوێنەوارناسەکە دەزانێت کە ئەم پارچە شعرە کێشراوە ،وەک بەرهەمێکی جوڵاوی ڕێکخراوی سەر زەوی و ڕۆژو ئاگر کەوتنەوەی سروشتی دارستان نیە وەک پارچە قوڕێکی برژێنراو لە خۆڕا یەکی گربێت و بووبێت بەم پارچە شعرە. تەنانەت گەر واشی دابنێین ڕەنگبێت ئەم پارچە شعرە لەخۆڕا یەکی گربێت و دروست بوبێت ، هەرچەندە ناشێت وابێت بەڵام مرۆڤ هەرچەندەی بیر لەم پارچە نوسراوە شعریە بکاتەوە زیاتر دڵنیا دەبێت ئەم نوسراوە لەخۆڕا دروست نەبوە وە زیاتریش دڵنیا دەبێت کە بۆ مەبەستێک کێشراوە.

با نمونەیەکی تر وەربگرێن لەسەرشتێك ئێمە زۆربەمان لەسەر بنچینەیەکی ڕێکوپێك بەکاری دێنین ئەویش مۆبایلە. مۆبایلەکەت لەسەر هەندێ توخمی ماددی پێکهێنراوە ، ئەوانیش پلاستیك و شووشە و سیلیکۆنن وە هەندێک کانزانی بەنرخ. پلاستیك لە نەوت دەست دەکەوێت ، وە شووشەو سیلیکۆن لە لم دەستدەکەوێت. بۆیە ئەو مۆبایلەی کە تۆ لە دەستت هەڵی دەگری لە بنەڕەتەوە نەوت و لمە. ئێستا گەرپێت بڵێم من لە بیابانی عەرەبستان دەڕۆیشتم(نەوت و لمی زۆری لێیە) مۆبایلێکی لێبوو منیش هەڵم گرتەوە کە بەرهەمی ملیۆنەها ساڵی ڕوداوێکی کتوپڕە. با هەڵی کرد و ڕۆژ درەوشایەوە و باران باریو ، بە بریسکایی ڕۆژ نەوتەکە بڵقی کردو حوشترێک هاتو پێی لێنا وە دوای ملیۆن ملیۆن ساڵ مۆبایلکە خۆی دروستبوو، منیش

به ئاسایی مۆبایلەکەم هەڵگرتەوەو دوگمەی تەلەفۆنەکەم داگرت و ..."ئەلۆووو دایکە چۆنی ئەحوالو چۆنە" ؟؟

ئایا هیچ هەلێک هەیە کە ئەمە بە ڕێکەوت ڕوویدابێت لەڕێگەی پرۆسەی سروشتیەوە مۆبایلەکە خۆی خۆی پێکهێنابێت.بەهەرحاڵ ڕێتێچوونی زۆر دوورە ، زۆربەمان ئەمە وەك ڕوونکردنەوەیەکی ماقوڵانە قەبووڵ ناکەین.

جا بۆچی دەبێ ئێمە وە ها ڕوون کردنەوەیەك قەبووڵ کەین دەربارەی گەردوون و ژیان؟ ئەگەر پەرەسەندنیش وەك پرۆسەیەک قەبووڵ کەین، ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ ژیان تەنها زنجیرە ڕووداوێکی بە ڕێکەوت بووە، قەبووڵکردنی گرانە وەك ڕوونکردنەوەیەکی ماقوڵانە، هەتا سادەترین خانەی مرۆڤ ئاڵۆزترە لە مۆبایلێك! بە لایەنی کەم هیچ نەبێ بیردۆزی پەرەسەندن هەوڵی داوە کە هەندێك ڕوونکردنەوە پێشکەش بکات کەچۆن ڕووی داوە، بەڵام ئەمبیرۆکەیەی دەڵێ گەردون بەرهەمی چەند ڕووداوێکی ڕێکەوتە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی ئەوتۆی نیە، وە ئەو یاسا و سیستەم و پێکهاتانەی گەردونیان پێک هێنێناوە زۆر زۆر ئاڵۆزترن لە ڕێکو پێکی بەڕێوبردنی ژیانی زیندەوەران.

با نموونەی زەوییو سیستەمی خۆر وەر بگرین. زەویی هەموو ٢٤ کاتژمێرێک بەدەوریخۆی دەسوڕێتەوە. بێنە بەر چاوت زەوی زۆر بە هێواشی بخولێتەوە. شەوو ڕۆژێك ٣٠ یان ٤٠ ساڵ درێژبا لە جیاتی ٢٤ کاتژمێر. ڕووکەشی بەشێک لە زەوی ڕووی لە ڕووناکی ڕۆژ دەبوو وە بەشەکەی تری لە تاریکی دادەبوو. جا ڕووکەشی زەوی یان لەوپەڕی گەرمی دادەبوو یان لەوپەڕی ساردی. یان ئەگەر لە خۆر نزیکترباین وە یان دوورترباین ئەوا زەویی یان زۆر زۆر گەرم دەبوو یان زۆر زۆر سارد دەبوو. یان ئەگەر پێکهاتەی گازەکانی بەرگی هەوا تێکەڵەیەکی تەواو و دروست نەبا لە دوانە ئۆکسیدەکان و نایترۆجین، یان ئەگەر چینی ئۆزۆن نەبا بۆ پاڵاوتنی تیشکەکانی خۆر لە گاریگریە خراپەکانی، بە بێ پاڵپشتی هەریەکێک لەم بارە ڕێکو پێکانە هەبوونی ژیان ئەستەمە.

کاتێك تەماشای بیردۆزی بیگ بانگ دەکەین کە بنچینەی دروستبوونی گەردوون ڕووندەکاتەوە. ڕەنگە یەکێك پرسیار بکات و بڵێ " لەکەیەکەوە تەقینەوەکان ئەم سیستەمە ئاڵۆز و هاوسەنگەیەن پێکهێناوە؟ وە لە کەیەکەوە پێکهاتەی ئاوێتەی ئەم ژیانە پێکهاتوە ؟" سەرەڕای ئەوەی هەندێک خەڵك پێشنیاری هۆکاری کەون و بیگ بانگیان کردوە! ڕەنگە یەکێك بڵێت ئەمە پرۆسەیەکی زۆر سادەیەو تەنها ڕوویداوەو تەواو. سەرەڕای ئەوەی زانستیش پێشنیاری ئەوەی کردوە کە ئەم یاسایانەی گەردوون بەڕیوەدەبەن زۆر بە باشی و ڕێك و تۆکمەیی ڕێکخراون کە ژیان بوونی نابێت بە بێ ڕادەی باشی و وردیی ڕشتی ڕێکخستنی ئەم یاسایانە.

ئەم یاسایانەش جێی تێرامانن لەوەی پێیان دەگوترێت نەگۆڕەکانی سروشت، زۆر هەن بەڵام جەخت دەکەینە سەر چوار هێزە ناسراوەکان: هێزی ناوکی بەهێز و هێزی ناوکی لاواز و هێزی کارموگناتیسی و هێزی کێشکردنی زەوی. دوو لەمانە هێزی کارۆموگناتیسی بەهێز و لاواز بەرپرسیارن لە بەرهەمهێنانی کاربۆن، ئەو توخمەی هەموو ناسراوەکانی ژیانی لەسەر بونیاد نراوە. هێزەکان بە ڕێگایەك هاوکاری یەکتری دەکەن لە پێناو بەدیهێنانی هاوسەنگی ئاستەکانی وزە، کە ڕێ بە بەرهەمهێنانی کاربون دەدات لە پێکەوە نوسانی سێ لە ئەتۆمەکانی هیلیۆم بە لێکدانی ئەو سێ گەردیلانەو بەدیهینانی کاربۆن زۆر دوورە کە ڕێی تێ بچێ، لەبەر ئەوەی لە بارو دۆخێکی ئاساییدا هێزەکان یەکناگرن بۆیە سێ گەردیلەی هیلیۆم لەیەکتر جیا دەبنەوە بەرلەوەی بەیەکەوە بلکێن و کاربۆن پێکبهێنن. بەڵام ئەگەر هێزەکان بە ئامارێکی نائاسیی یەکیان گرت، ئەوا پرۆسەکە زووتر ڕوو دەدات. بەکەرمترین گۆڕانکاری لە هەریەکێك لە هێزە کارۆموگناتیسیەکان دەبێتە هۆی گۆڕان کە ئاستەکانی وزە دەرەنجام بەرهەمی کاربۆن بە ڕێژەیەکی زۆر کەم دەکات وە لە کۆ تایی گەردوون شوێنیکی نەشیاو دەبێت بۆ ژیان.

هەروەها لە هێزی ڕاکێشان ڕامێنە کاتێك بە بلیۆنان سال دوای بیگ بانگ مادە لە گەردوون بە هەڕەمەکیی دابەشببوو نە هەسارەو نە کاکێشان نە ئەستێرە هەبوون. گەردەکان بە تەنهایی لە بۆشایی گەردوون دەسووڕانەوە. لە کاتێک کە گەردوون دەستی بە فراوانبوون کرد. هێزی ڕاکێشان زۆر بە نیانی گەردیلەکانی ڕایکێشان و کۆیکردنەوە بۆ کەستەك کە لە ئەنجاما بوون بە ئەستێرەو کاکێشان. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە هێزی ڕاکێشان دەبێ بەتەواوی لە جێگای خۆی بێت. ئەگەر هێزی ڕاکێشان کەمێک بێهێزتربا ئەوا گەردیلەکان زۆر بە فراوانی بڵاودەبوونەوە و هەرگیز کۆنەدەبوونەوە بۆ ئەوەی ببن بە گەلەستێرە و ئەستێرەو هەسارەکان. ئەگەر هێزی ڕاکێشان کەمێك بەهێزتربا ئەوا گەردیلەکان هەموویان بەیەکەوە ڕادەکێشران دەبوون بە یەك تۆپەڵ. هێزی ڕاکێشان دەبێ تەواو درست ولە جێی خۆیبێت بۆ دروستبوونی ئەستێرەکان. جا تەواو دروست و لەجێ خۆبوون چیە؟ بێنە پێشچاوت کێشیت یەك لە ملیار کەم یان زیادبێت لە گرامێك واتە (0.000000001) گۆڕابێت کەم یان زیادی کردبێت لە گرامێك. ئەمە ئەم بڕە جیاوازەیە کە باسی دەکەین لە گەردوون. کە بەم بڕە جیاوازیە نە هەسارە و ئەستێرە نە ژیان نەدەبوون.لە پاک بوونەوە و توێکڵ فڕەدان نوێبوونەوەی چەند کیلۆیەک ئاسایی دیارە. زۆر سەیرە مرۆڤە ئاقڵە ڕووناکبیرەکان ناتوانن و ناکرێ لەو وەزنەی کە هەیانە خۆیان نوێ بکەنەوە و توێکڵ فڕەدەن و خۆیان پاك بکەنەوە، تاکوو زیاتر بژیین. بەڵام بۆ گەردوونی بە ئاسایی دەزانن و دەڵێن گەردوون دەتوانێ و بۆی دەسازێ خۆی ڕێکبخات و بسازێنێ بۆ باشترین حالەتەکانی ژیان لە ڕێگای ڕێکەوتەوە. با لە نزیکترەوە تەماشای خێرایی فراوان بوونی گەردوون بکەین لە دوای بیگ بانگەوە. ئەگەر ڕادەی خێرایی فراوانی بوونی گەردوونی

زیاتر با ئەوا گەردوون زۆر بە خێرایی فراوان دەبوو لەو کاتە ماددە زۆر پەرشو بڵاو دەبووەو، جا هێزای ڕاکێشان هەرگیز نەیدەتوانی ماددە خڕکاتەوە سەریەك بۆ دروستبوونی ئەستێرەو گەلەستێرەکان. ئەگەر ڕادەی فراوانبوونی زەوی کەمێك هێواشتربا ئەوا هێزی ڕاکێشان هێزی فراوانبوونی گەردوونی نغرۆ دەکردوو وە هەموو ماددەی ڕادەکێشایە ناو کونە ڕەشەکان. ئەگەر خێرایی فراوانبوونی گەردوون یەك سانیە لە دوای بیگ بانگ هێواشتربا ئەگەر بە نزیکەی بەشێك لە هەزار ملیۆن ملیۆن هێواشتربا ئەوا دەبوە هۆی داڕوخانی گەردوون بەر لەوەی بگات بە قەبارەی ئێستای خۆی. لە ڕاستی خێرایی فروانابوونی گەردوون تەواو لە جێی خۆی بوو جا لەبەر ئەوە ئەستێرەکان لە گەردوون هاتنە بوون.

نمونەیەکی تر لە وردی و ڕێك و ڕشتی و گونجاوی چڕی گەردوونە. بۆ ئەوە گەردوون دەبێت بە شێوازێك گەشە بکات کە دەبێت چڕیەکەی لەوپەڕی پارێزراوی و وردی بێت. تەواو دروستی چڕی گەردوون زۆر گرنگە کە بە گۆڕانی بەشێک لە 0.00000000000001 دەبێتە هۆی داڕوخانی گەردوون، یان تێکشکانێکی گەورە، هەر زۆر زوو ڕووی دەدا بەرلەوەی ژیان گەشە بسەنێ. یان فراوان بوونێکی زۆر توند دەبوو نە ئەستێرەو نە کاکێشان و نە ژیان دروست نەدەبوون.

مۆبایلەکەی ئێمەت لەبیرە لە بیابان؟

ئایا مەنتقیتر نیە کۆتایی بەوە بێنین کە گەردوون و ژیان بەرهەم و نەخشەکێشراوی ژیریو مەبەستە؟

دوای هەموو شتێك بیرۆکە هەڵبژێردراوەکان چین؟

دەکرێ هەر لەخۆیەوە هەر لە هیچەوە دروست بووبێ؟ ئەگەر وایە جا بۆ لەخۆدروستبوون هەموو شتێکی ژیان ناگرێتەوە؟ پیاوە دەرپێ سوورەکە ڕەنگە هەر لەخۆیەوە دەرکەوتبێت**!**

دەکرێ خۆی خۆی داهێنابێت و دروست کردبێت. باشە ئێمە ئەوە ناخەینە پاڵ ئەستێرەو کاکێشانەکان کاتێك بە گەردوون دەڵێین توانایی نەخشە کێشان و سیستەم دانان. بەڕاستی ئەمە پێویستی بە ژیری و ئیرادە هەیە.

جا ئەگەر ئەقڵی تەواو هۆشیار بە دوای بڕیارێکی یەکلاکەرەوە بگەڕێ، ئەوا چ بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی ئەقڵیمان هەیە؟

یەك بڕیار کە بە دڵنیایەوە بگات ئەوە یە سروشتی سەرچاوەی ئەم ژیریو ئیرادەیە دەبێت جیابێت لەگەڵ سروشتی ئەم گەردوونە کە بەدیهێنراوە.

بۆچی دەبێ جیاواز بن؟ لەبەرئەوەی ئەگەر هەمان شت بوون جا ئەوەی هەمانە واتە ئەم گەردوونە زیادەیەکە لە هەمان شت. مەخولقێکی زیاترە وە دواتر ڕەنگە یەکێکی تر بڵێ ئەی کێ ئەوی دروستکردوە؟ بە دڵنیاییەوە شتێکی ژیرترو بە ئیرادەتر. وە دواتر هەمان پرسیار دەکەینەوە ئەی کێ ئەوی دروستکردوە وە ئەمەش بۆ هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت بەدوای ژیری و ئیرادەیەکی بەرزتر دەگەڕێت خالق خالقی دروست کردوە ئەویشی خالقێکی تر دروستی کردوە وە بۆ هەتا هەتایە بەردەوامدەبێت. هۆکارێکی باش هیە بۆ ئەوەی بڵێین بۆ شتەکان نابێت ئاوابن و لەگەڵ مەنتیق ناگونجێت کە وابێت. ئەمەش بە باشترین شێوە لە ڕێگەی ئەن نمونەیەوە ڕوون دەکرێتەوە.

قەناسێک بێنە پێش چاوت نیشانێکی دیاری کردوە وە ڕادیۆ بۆ بارەگای سەرەکی خۆی دەکات بۆ ئەوەی ڕێی پێ بدەن تەقە لە نیشانەکە بکات وە بارەگای سەرەکی بە قەناسەکە دەڵێ بوەستە تاکوو ڕێپێدات لەسەرووترەوە فەرمان وەربگرێ وە هەروەها ئەویش وەهەروەها ئەویش بۆ هەتا هەتایە بەردەوامدەبێت.

ئەگەر ئەمە ئاوابت ئایا قەناسەکە ئەتوانێت تەقە لە نیشانەکەی بکات؟

بە دڵنیاییەوە نا.

وە ئەو بەردوامدەبێت لە چوەڕوانی کەسێکی بەرزتر تاکوو فەرمان دەربکات.دەبێت شوێنێك یان کەسێك هەبێت کە فەرمان کۆتایی پێ هاتبێت هەموو شتەکە لەدەست ئەوبێت شوێنێك یان کەسێك لەو بەرزترنەبێت.

نمونەکەمان ئەوە دەردەخات بۆچی بۆشاییەکی ئەقڵی هەیە لەم بیرۆکەیەی کە دەڵێ ڕەنگە خالقەکان خالقەکانیان بۆ هەتا هەتایە دروست کردبێ. ناشێت بۆ هەتا هەتایە خالقەکان خالقەکان بەدیبێنن هەروەك ئەوەی قەناسەکە بۆ هەتاهەتایە تەقەناکات، وە بوونەوەریش قەتو قەت دروست نەدەبوو. بەڵام بوونەوەر لێرەیەو بوونی هەیە. جابویە دەبێت ئەم بیرۆکەیە وەلانێین و وەدەرنێین لەسەر پاشە کشەی بێ کۆتایی هۆکارەکان وەك ڕێژەیەکی نا ئەقڵی.

جا جێگرەوەی چیە؟

جێگرەوەی ئەم بیرۆکەیە یەکەم هۆکارە.

هۆکارێکی بێ هۆکار.

دەتوانین کۆتایی بەوە بێنین بەوەی کە سیفەتی ئەو ژیری و هێزە مەبەستاویەی (ئەنقەست) لەودیو گەردونەوە هەیە، دەبێت ژیان و هەمووشتێکی ئەو زاتە جیاواز بێت لە بوونەوەر، هەر وەك دەیبینین هۆکاری ناچارکەر هەن.

جا ئەگەر بوونەوەر هەژاربێت یان جێی نیاز(محتاج) بێت ئەوا پەروەردگار بێ نیازە و پێویستی بە هیچ شتێك نیە .

وە ئەگەر بوونەوەر کاتی بێ، ئەوا پەروەردگار هەمیشەییە.

وە ئەگەر بوونەوەر سنورداربێت بە کات و شوێن ئەوا پەروەردگار دەبێ خاڵی بێت لە کات و شوێن.

وە ئەگەر بوونەوەر هاوبەش(مشترك) بێت ئەوا پەروەردگار دەبێ بێ هاوتابێ.

وە ئەقڵ خوازیاری ئەوەیە کە دەبێ تەنها یەك بێهاوتا و یەك هەمیشەیی و یەك بێنیاز هەبێت بێسنووربێت لە کات و شوێن. ئەگەر لە یەکێك زیاتر هەبوو ئەوا ئەو سیفەتانە دانەدەمەزران. چۆن دەبێت دوو زاتی هەمییشەیی هەبن یان دوو زات بێ سنوور بن لە کات و شوێن؟

جا بویە ئەقڵ تەنها ئەوە قەبووڵدەکات کە دەبێت یەك زات هەبێت هەڵگری هەموو ئەو سیفەتانەبێت.

مەنتیق و ئەقڵی تەواو بە ئاسانی پێشەنگ دەکات یان ڕەنگە بە مسۆگەری بگات بە دەرەنجامی کە گەردوون لە لایەن زاتێکی بەرزی بەدەر لە جیهان بەدەر لەسروشت بەدەر لە کرۆکی هەرشتێک کە ئێمە پەی پێ ئەبەین.

بێگومان ئەم تێگەیشتنە دەبارەی پەروەردگار لە ڕێگەی ئەقڵەوە گرانتر ئەکا جا بۆیە هەندێك کەس هەر لێرە ئەوەستن.

بەڵام گەشتەکەمان لێرە کۆتایی پێنایەت لە ڕاساتی لە زۆر ڕێگاوە ئەمە تەنها دەستپێکیەتی. هێشتا پرسیارگەلێکمان ماون لێیان تێبگەین. زۆر لەبابەت و کێشەکان چارەسەرنەکراون.

## بەندی دووەم

## پرسیارە وەڵامنەدراوەکان

بۆچی لە دونیا ئەشکەنجەو ئازار هەیە؟

ئەگەر پەروەردگار بوونی هەیە، بۆچی ئەم پەروەردگارە ڕێگە بە ڕودانی شتی خراپ دەدات؟

ئامانجی ژیان چیە؟

ئێمە بۆچی لێرەین وە ئەمە هەمووی لەپێناو چیە، وە بۆ کوێ دەچین؟

ئایا ژیان هەیە لە دوای مردن؟

ئایا هیچ ڕێگا هەن بۆ ئەوەی زیاتر دەربارەی ئەم پەروەردگارە بزانیین؟

ئەمە سەرسوڕهێنەر نیە وە سەیر نیە بۆ ئەوەی چاوەڕوانی پەروەردگاری ئەم کەونە بکەین هەندێك ڕابەریمان بکات بۆ بابەتێکی وا گرنگ، لەوکاتەوەی ئەم پەروەردگارە هۆکارو وەسائیلی داوە پێمان بۆ ئەوەی ڕازی بین بەو پێداویستیانەی هەمانە لە هەردوکیان ماددی و مەعنەوی. هەست بە برسیەتی دەکەین و پێویستمان بە خۆراکە بۆ بەردەوامی و هێز. وە هەموو هۆکار ووەسیلەیەك هەیە بۆ بەدەست هێنانی خۆراك. تێنومان دەبێت و خواردنەوە هەیە، پێویستمان بە جل و بەرگە وە ڕێگا هەیە بۆ خۆ پاراستن لە شتەکان هەتا دوایی. وە پێویستمان بە هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و پشتگیری وە داك و باوك خێزانمان هەیە، وە ژیان لە ناو کۆمەڵگا تەواوکەری ئەم پێویستیانەیە. وە ئەمەش ماقوولە ئەو زاتەی ڕێگاو هۆکاری پێ داوین بۆ گەیشتن بەم پێویستیانە، بە هەمان شێوە ڕێگاشی داناوە بۆ گەیشتن بە وەڵامی مەسەلەی وا قووڵ و زۆر پێویست و گرنگ.

لە ڕاستی پرسیاری وا قووڵ گرنگترن لە مەسەلە مادیی و مەعنەویکان، لەبەرئەوەی ئەم پرسیارانە بە وردی بە (تایبەتی) پێناسەی هۆکاری بوونی تێدایە. بەڵگە پیشان دەدرێت کاتێك خەڵك هیچ ئاڕاستە ئامانجێکی ڕوون و قایلکەریان نیە لە ژیان، وەک تاك و وەك کۆمەڵ بە قووڵی بێزار و سەرلێشێواو نارەحەتبوون. جا پیویستە بزانین ئێمە بۆچی لێرەین و بۆ کوێ دەچین وە ئەمە هەمووی لە پێناو چیە وە بۆ دەخۆین و خۆینەوە و جیماع دەکەین.

ئەگەری وەڵامگەلێکی زۆر هەیە بۆ ئەم پرسیارانە، وە تەماشاکردنی ئەو بیرۆکە جیاوازانەی دێنە فکری بەشەرەوە، وا دەردەکەوێ ڕەنگە هۆش و بیر باشترین ڕێگا نەبێت بۆ

دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە سەرلێشێوێنەرانە لەبەرئەوەی ئەوەی ئێمە دەمانەوێت ئەوە نیە بەس وەڵامبێت و تەواو بەڵکوو وەڵامە ڕاستەکەمان دەوێت. کێشەکە لێرە ئەوەیە ئەمە ڕووبەرێکە کە ئەقڵ ناتوانێ بەڕێکی وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە.

بۆ نموونە بێنە پێش چاوت کەسێك بدبات بۆ بینایەکی نامۆ. لە دەرگا داخراوەکەی پیشەوە ڕاوەستابی، وە کەسەکە پرسیارت لێ بکا بڵێ چی لە پشت ئەم دەرگایە هەیە لە ناوەوەی بیناکە؟ وە بە هۆی ئەقڵەوە تا چەند دەزانی؟ ڕەنگە بە ت هەندێك شتت بە بیردا بێت، بۆ نموونە ڕەنگە هەندێك کورسی و مێز و گڵۆپ و بەلۆعەی لێبێ؟ ڕەنگە هەڵە بی. ڕەنگە بەتەواوی بەتاڵبێ ڕەنگە بەتەواوی پڕ بێ. ئەگەری هەر شتێکی هەیە. جا چۆن دەتوانی بزانی ، چۆن دەتوانی بگەیت بە دڵنیابوون دەربارەی ئەوەی کە چی لە پشت ئەم دەرگایەوە هەیە؟ جا بە دڵنیاییەوە دەتوانی بچیتە ناوەوە بە چاوەکانی خۆت ببینی. بەڵام ئەی ئەگەر ئەمە نەکرێ نەتوانی بچیتە ژوورەوە؟ جا چۆن دەتوانی بزانی چی لە ژوورەوە هەیە؟

یەك ڕێگا هەیە ئەوەیە کە کەسێک لە ژوورەوە بوو‌بێت و پێت بڵێ کە چی لە ژوورەوە هەیە. بەڵام پرسیارەکە لێرە ئەوە چۆن بڕوا بەو پیاوە بکەم؟ چۆن بزانم کە ئەو کەسە ڕاستی دەڵێ؟

هەمان شتە لەگەڵ پرسیارە گەورەکان؛ ئامانجی ژیان چیە؟ لەبەر چ ناخۆشی هەیە؟ ئایا هیچ ژیانێك هەیە لە دوای مردن؟.. چی لە پشت ئەم دەرگایەوە هەیە؟ ئەمە شاراوەیە نەبینراوە نەزانراوە، فکر ناتاوانێ بگات بە وەڵامێکی براوەو کۆتایی پێهاتوو. وە هیچ ئەقڵێك نیە بگات بە رادەی بەڵگەنەویستی، وە هەست کردنیش شتێکی وای پێناکری.

ئێمە دەتوانین بگەین بە هەر پلەیەکی دڵنیایی کاتێك کەسێك هەبێت لە ڕێگای ئەقڵی ساغەوە بزانین کە راستگۆیەو ڕاستی دەڵێ.

بە دڵنیاییەوە هێشتا پێویستمان بە ئەقڵە، مەبەستمان ئەوەیە تەنها ئەوەیە ئەقڵ وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی زانیاری دەربارەی ئەم بابەتانە سوودێکی ئەوتۆی نیە. بەڵام پێویستمان بە ئەقڵە بۆ ئەوەی بزانین بڕوا بە کێ بکەین.

گەڕاینەوە بۆ پیاوە دەرپێ سوورەکە! بۆچی دەبێ بڕوا بە داواکاریەکەی بکەم یان ڕەتی کەمەوە؟

ئاینەکان بە گشتی بانگەشەیەکی تایبەتیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەوان پەیامێکیان لە پەروەردگارەوە پێیە، وە پەیامەکەش تایبەتە بەو ئاینە، جا کێشەکە ئەوەیە: من ڕاستم ئەوانی

دی هەموو هەڵەن! مەبەست ئەوە نیە کە ئەم بانگەشەیە خۆی لە خۆی دا کێشە بێ لە ڕوانگەی ئەقڵەوە. جا بۆیە ئەگەر ئەم پەروەردگارە حەکیمە پەیامێکی بۆ ئێمە ناردبێ حەتمەن دەبێ سازگار و مەحکەم بێ، جا کاتێك هەندێک ئاین بانگەشەی شتی جیاواز دەکەن، نابێت هەموویان ڕاست بن. وە بەرنگاریەکە لێرە لە بڕیاردانە کە کامەیان ڕاستە. جا ئا لێرە لە جیاتی پیاوێک حەوت پیاو لەبەر دەرگات ڕاوەستاون بۆ خوێندنەوەی سەعاتی گاسەکە.

دەبینی ئەوانەی لەبەر دەرگات ڕاوەستاون و هەموویان پرۆسەی ئەقڵ بەکاردێنن، چەند شتنائێك هەن دەتوانی بەکاریبێنی بۆ هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنی ئەو کەسەی کە گاس پێوە ڕێی پێ بدەی بێت گاسەکەت بۆ بپێوێ. بۆ نموونە ڕەنگە نەسنامەی کۆمپانیای پێ بێ وە بە جلی تایبەتیەوە بێت و ناوی کۆمپانیاکەی لەسەربێت کە تۆ پێویستە پارەکەی پێ بدەی، وە دەبێ ئامێرێکیشی پێ بێ بۆ پێوانی گاسەکە. بەهەمان شیوە هەندێک نیشانە هەن ئیمە دەتوانین بەکاریانبێنین بۆ جیاکرددنەوەی ئاینی ڕاست دروست لە ناڕاست.

لە دۆزی ئاوا هەستیار ڕەنگە لایەق بێ کەمێک کات بگرین بۆ بیرکدنەوە لە جۆری ڕێگا نەشیاوو چەوتەکان. بۆ نموونە ڕەنگە کەسێك بەمجۆرە هەڵبژێریت و بڵێیت : کامەیان بە من دەچێ و لە تیرەو ڕەگەزی منەوەیە؟ ئایا ئەم جۆرە بیرکردنەوە بەکاربێنی بۆ بڕیاردان لە ڕیگەپێدانی ئەوکەسەی پێویستە بێتە ماڵت بۆ خوێندنەوەی گاس ژمێرەکە؟ لەگەڵئەوەشدا تاوانبار لە هەموو تیرەو رەگەزێك و ڕەنگێک هەن، هەر وەك خوێنەری گاس ژمێرەکان.

جا ڕەنگە بڵێیت: وا هەست ئەکەم ئەمەیان ڕاست بێت، وە تەواو بڕوای پێ دەکەم ڕاست بێ. نا وانابێت بەبێ بیرکردنەوە تەنها بڵێی وا هەست ئەکەم، چۆن ئەبێت؟

وە ڕەنگە بڵێیت ئەوەی کە شتێکی باش پێشکەش دەکات، وە کو ئەوەی بلێت (ئەگەر بڕوام پێ بکەی ڕێگەم پێدەی بۆ خوێندنەوەی گاس ژمێرەکە ئەوا بۆ هەتا هەتایە گاست بە بەلاش دەدەمێ! لە خشتە بردنە بەڵام دوورە لە ئەقڵ.

وە ڕەنگە ئەو کەسە هەڵبژێری کە بە کەسێك بچێت ئەو کەسە پێشترهەندێك جار لە دەرگای ماڵی باوکتی دابێت( وە ماڵی باوکیشت قەت و قەت گاسیان نەبووبێت)

ئەی ئەگەر هەڵبژاردنەکەت لەسەر بنەڕەتی ئەوەبێت بڵێت کامەیان قۆز و زرنگەو پارەی زۆرتریشی پێە.

مەبەست لێرە ئەوەیە کاتێك باسەکە دێتە سەر ئاین پێویستە هەندێك بیرۆکە وەلا بنێین، بۆنموونە بەدواکەوتنی بیروباوەڕی بابو باپیرانت تەنها لەبەر ئەوەی ئاشنایە بۆت. یان

لەبەرئەوەی ئەوانت زۆر خۆشدەوێت یان لەبەرئەوەی بلێیت چۆن ئەبێت ئەوان هەڵەبن! ئێوە زۆر کرداری جیاواز دەکەن لە کرداری داك و باوکتان ئەگەر زۆریش نەبێ جیاوازی هەر هەیە لەبەر ئەوەی پێتان هەڵەیە، جابۆ دەربارەی ئەم شتانە دەکرێ ئەوان هەڵە بن بەڵام دەربارەی ئاین ناکرێ.؟

بە سادەیی هیچ هۆکارێکی ناچارکەر نیە بۆ وەرگرتن و گرتنە ئەستۆی هەر شتێک کە دایك و باوك و ڕەچەڵەکت بڕوایان پێبووبێت ڕاست بێ، وە هیچ مانایەکی ماقووڵی تێدانە، تەنها باوەڕبینەو تەواو وە هەنگاوی باوەڕهێنان بهاوێژی بێ هیچ پاساوێکی ماقوڵانەی دروست و ڕاست.ئەی ئەوە چ جۆرە بیرکەدنەوە و هۆشداریەکە ڕێبەریت بکات کۆتایی بە بابەتەکە بێنی بەوەی کە ئاینی ڕاست دابێ دەوڵەمەندت بکات، یان تەنها بەوەی باوەڕت بە کەسێك یان شتێکی تایبەت هەبێت ئەوە ژیانی هەتا هەتایی بەدەست بێنی بێ ئەوەی هیچ کردارێك چاك بکەی. بە دڵنیایەوە یەك لە هۆکارە پەسەندەکان بۆ پاساو هینانەوە لە هەڵبژاردنی ئاینێك ئەوەیە کە کەسێك شوێن ئەو ئاینە کەوت و پەیڕەوی کرد، ئەوا ئەو ئاینە ژیانیانی گۆڕیوەو خۆشحاڵ و کامەڕانن. لە ڕاستی ئەمە کەمێك ماقوڵانەیە. جا هەندێك هۆکاری ڕاست هەن تاکو باوەڕی پێ بکەی و بڵێیت ئا ئەوەیە ئاینی ڕست و ئاوا دەکات، بەڵام کێشەکە لێرە ئەوەیە زۆرێک لە خەڵکی دی هەمان بانگەشە دەکەن دەربارەی ئەزموونی ئاینی جیاوازیان. وا دیارە ئێمە بۆ ئەوە بەدیهێنراوین تاکوو دینداربین. ئەمە بەشێکە لە سروشتی ئێمە. ئەگەر شوێن یەکێک لە ئاینە باوەکان نەکەوین ئەوا ئاینێك دادەهێنین! جا هەندێك ئاین کامەڕانترمان دەکەن لە بێ ئاینی. وە دوبارە، بانگەشەکردن بۆ ڕاسی ئاینەکەت تەها لەبەرئەوەی ژیانی تۆی گۆڕیوە خۆی لە خۆیدا نابێتە پێوانەیەکی دروست، لەبەر ئەوەی ئەگەر بەم پێوانەیە بێت دەبێ ئاینەکانی تریش ڕاست بن چونکە ئەوانیش ژیانی خەڵکیان گۆڕیوە. ئەگەر کەسێک بڕیاری ئەوەی دابێت کە هیچ پەروەردگارێك نیە بۆ ئەم بوونەوەرە وە بانگەشەی ئەوە دەکەن پێشتر لەسەر ئاینێک بوون ئێستا وازیان هێناوە وە دەڵێن زۆر دڵخۆشو ئازادن بە قسەی خۆیان، ئەوەی بۆ قاز باشە بۆ نێرە قازیش باشە.ئەگەر ئەوە بۆ یەکێک ڕاست بێ بۆ ئەوانی تریس ڕاستە.

بۆیە ئەوانە بانگەشەی رووتن، بانگەشە کردن بۆ شتێک پێویستی بەسەلماندنە.

وە ئاینی ڕاست (ئەگەر ئاینێک هەبێت) دەبێ هەندێ بەڵگەو ناسنامەی هەبێت، دەبێ هەندێ نیشانەی هەبێت تاکوو ئێمە لە ڕێگای ئەوانەوە بزانین کە لە پەروەردگارە وە هاتوە.

جا تاقیکردنەوەکان کامانەن کە ئێمە دەتوانین بەکاریان بێنین بۆ ناسینەوەی ئەم ئینانە؟

## بەندی سێیەم

# تاقیکردنەوە فێرکاریەکان

یەکەم تاقیکردنەوە وە دەشێت باشترین و سەلمێنراوترین تاقیکرنەوە زۆر زوو لەگەڵ هەندێك هەڵبژاردن بەجێماندێڵێت.

ئایا دەربارەی پەروەردگار چی دەڵێت؟ کامە ئاین پێمان دەڵێ تەنها یەک پەروەردگار هەیە کە سیفاتەکانی جیاوازن لە سیفاتی بەدیهێنراوەکانی: یەکە و هەمیشەییە و بێ نیازە و جێ ی نیاز و ئومێدە، گەورەو بەرزە؟

لەێرە مەبەستم نیە ڕەخنە لە هیچ ئاینێك بگرم یان گاڵتە بە هیچ ئاینێك بکەم، لە کاتێك هەموو ئاینەکان بەها ئەخلاقیەکان فێری خەڵك دەکەن و هانی خەلك دەدەن بۆ ئەم بەهایانە. هەموویان خاڵی بەهێز و لاوازی جۆراوجۆریان هەیە. بەڵکو ئامانج تەنها وردبوونەوەیە لە ئاینەکان لە ژێر ڕووناکی ئەو پێوانەیە سادە و جیهانیە.

لە ژێر ئەو ڕووناکیەی هەمانە، جا ئەوانەی شایەنی مشت و مڕبن سیانن: یەهوودی و زەردەشتی و ئیسلام. مەسیحەکان ڕەنگە داوای ئەوە بکەن ئەم کۆمەڵە ئەوانیش بگرێتە خۆ، بەڵام بە پێی هەڵوێستی بیرو باوەڕی مەسیحیەکان دەبێ بخرێتە پاڵ کۆمەڵە ئاینەکانی تر، ئەوانەی چەکی پەروەردگاری بێهاوتایان بە ڕێگایەك لە ڕێگاکان شێواندوە.

بۆ نموونە، هیندۆیزم بە گشتی بیرو باوەڕێکی یەکیەتیان(وحده الوجود) بۆ خوا هیە. ئەم بیرۆکەیە دەڵێ هەمووشتێک خوایە. گەردوون و زەوی و مانگ و ئەستێرەکان و دارەکان و ئاژەڵەکان و ئێمە هەموویان خوان.

چون ئێمە هۆشدارانە بانگەشەیەکی ئاوا لێکدەینەوەو لێی تێبگەین؟ ئەگەر ئێمە مەبەستمان لە خوا خالق بێت، جا بە پێی ئەم بانگەشەیە بێت دروستکراو خۆی خۆی دروستکردوە، وە دروستکراو دروستکەرە. ئەمە چۆن سروشتی گەردوونی سنوردار ڕوون دەکاتەوە، وە بەڵگەی ئەقلێ چیە بۆ پشتگیریکردن لەم بانگەشەیە؟ ئەمە وەک ئەوەیە بڵێیت گەردوون خۆی خۆی دروست کردوە. بەڵام ئەگەر گەردون لە ئەزەلەوە نەبووبێت ئەی چۆن خۆی دروستکردوە؟

وە ئێمە توانایی فەرماندان و سیستەم سازکردن ناخەنە پاڵ گەردوون ئەمە نە شایستەیی گەردووونە و نە سیفاتی گەردونە. گەردون لە ئەستێرە و مەجەڕەکان پێکهاتوە ، وە ئەوان

بەخۆیان پێویستیان بە پەروەردگارێکە. هوەچەندوی یەکە یەکەیان پێویستیان بە ڕێکخەرێکە، وە ئەوەندەش بە کۆمەڵ پێویستیان پێیەتی ! کۆمەڵە شتێکی خەوەن نیاز بە یەکەوە نابنە بێ نیاز. وڵاتێکی پڕ لە خەڵکی برسی نابێتە هۆی تێربوونی خەڵکەکەی، چ جیای کەسێکی برسی. ئاینی مەسیحیەکان بەشداری هەمان کێشەی هاوچەشن دەبن. بە دڵنیایەوە هەندێك لە دیانەکان بە هامان گفتو گۆ دێنە پێشەوە، بەڵام کە زیاتر دێنە پێشەوەو دەڵێن پێغەمبەر عیسای سنوردارو (مقید) و خاوەن نیاز خوابوو. کێشەکە لێرەیە ڕوونە. چون ئەقڵ قەبووڵ دەکا شتێك لە هەمان کات دوو سیفەتی تەواو پێچەوانە هەبێت.

**- چۆن دەبێت لە هەمان کات سنوردار و بێ سنوور بێت ؟**

**- چۆن دەبێت لەهەمان کات بێ سنوور و سنور دار بێت**

**- چۆن دەبێت لە هەمان کات بێ نیاز و جێی نیاز بێ؟ هەمیشەیی و کاتی بێت؟**

**- وە چۆند دەبێ هاوتا بێتو گشتی بێت، یەك بێت و زۆر بێت؟**

ئەوە وەک ئەوەیە بڵێیت بۆ نموونە بازنە بۆتە چوارگۆشە وە هەر بە بازنەیی ماوەتەوە. دەچێتە ئەقڵ کەسێك گەر بڵێیت هێلی بازنەیەك زەبری لێ بکەیت و بیکەیتە چوارگۆشە، بەڵام بە دلنیاییەوە لە بە بازنەبوونی دەوەستێت. یان یەکێک دەتوانێت چوارگۆشەیەک بکات بە بازنەو یان بازنە بکات بە چوارگۆشە، بەڵام ناکرێت لە هەمان کات هەردوکیان بێت. ئەمەش بە پێی ئەستەمی(استحالە) ، وە ناتوانی گفتو گۆیەکی ماقوڵانە بێنیەوە کە ئەستەم بێت. جا ئەمە بانگەشیەکە قەت و قەت ناسەلمێندرێ. کێشە گەورەکە لێرە ئەوەیە هەر لە سەرەتاوەئەم بیرۆکەیە پێچەوانەی گفتوگۆیەکی ماقوڵانەیە لە سەر هەبوونی پەروەردگار کاتێك دەڵێن بونەوەرێکی دروستکراوی سنورداری جێی نیاز دەشێت پەروەردگار بێت، لەبەر چ بوونەوەرێکی تر نا و یەکێکی تر نا و یەکێکی تریش نا؟ چۆن دەتوانی ژیرانە بەرگری لەبیرۆکەیەکی وا بکەیت دژ بە بیرۆکەی وەحدانیەت؟

بەزۆری وەڵامەکەیان دەڵێن ( خوا دەتوانێ هەموو شتێک بکات). بانگەشە کردنە دەربارەی خوا، وە بانگەشەکان دەربارەی خوا وەك هەموو شتێکی تر دەبێ بسەلمێندرێن. وە ئەمە وتەیەکە پڕە لە کێشە. بۆ نموونە ڕەنگە کەسێک پرسیار بکات بڵێت ئایا خوا دەتوانێ وجوودی خۆی ڕابگرێ؟ یان ئایا خوا دەتوانێ شتی خراپ بکات؟

دوو وەڵامی ئاسایی هەیە بۆ پرسیارێکی ئاوا، یان ئەوەیە نا ناتوانێ هەموو شتێك بکات کە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو گوتەیەی دیانەکان دەڵێن خوا دەتوانێ هەموو شتێك بکات. یان بەڵێ ئەتوانێ ئەگەر بیەوێ بەڵام خوا هەرگیز شتی خراپ ناکات چونکە سروشتی خوا چاکە.

بۆچی چاکەیی خوا ڕاستە بەڵام سیفاتەکانی تر نا؟ بە هەمان شێوە هەمان پێوانە جێبەجێ دەبێ لەسەر خوا کە بوونی یەکە، هەمیشەییو بێ نیازە. هەروەك ئەوەی لە سروشتی خوای پاك و بێگەرد دا نیە شتی خراپ بکات، بە هەمان شێوە لە سورشتی پەروەردگاری هەمیشەییو بێ نیاز نابێت ببێتە کاتیو جێی نیاز. بە هەمان شێوە بەنگەشەی پەروەردگار بۆتە دروستکراو وە لە هەمان سیفەتی پەروەردگارێتی خۆی ماوەتەوە بانگەشەیەکە هەرگیز ناسەلمێندرێ. ئەمەش بە پێی پێناسەی ئەستەمیەت، وە ئەمە لەسەر هەر ئاینێک جێبەجێ دەبێت کە بانگەشەیەکی ئاوا بۆ پەروەردگار هەڵبەستێ. وە ئەمە بەسەر زۆربەی ئاینەکانی تر جێ بە چێ دەبێت وەك هیندۆیەکان و بت پەرستەکان، کاتێک کە ئەوان بانگەشەی هەوشێوە بۆ پەروەردگار هەڵئەبەستن وەک هەندێک بونەوەر بەرجەستەی ئەکەن.

هەندێک لە مەسیحیەکان ڕەنگە بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئەوان ناڵێن مەسیح خوایە بەڵام کوڕی خوایە. کێشەکە لێرە ئەوەیە ئەوان مەبەستیان چیە کە دەڵێن کوڕی خوایە؟ کوڕی مرۆڤەکان وە دایکو باوکیێتی، جا کوڕی خواش خوایە؟ ئەگەر وابێ ئێمە گەراوینەتەوە ئەو شوێنەی کە لێوەمان دەست پێ کرد وە هەمان کێشەمی پێشمان دێتەوە ڕێ. هەروەها کوڕ بەرهەمی کردای جووتبوونە. جا ئایا خوا شتی وای لێ دەوەشێتەوە. بەڕوونی ئەمە پێچوانەیە لەگەڵ ئەو شتانەی زانیومانە دەربارەی خوا بە دروستکراوەکانی ناچێت. یان دەڵێن ڕەنگە خوا عیسای کردبێت بە کوڕی جۆی (تبیی) ؟ وە ئەمەش ئەقڵ قەبووڵ ناکات، چونکە تۆ دەتوانی کەسێك بکەیت بە کوڕی خۆت بەخۆت بچێت و وەکو خۆت بێت. بۆ نموونە ئەگەر کەسێک ماسیەکی ماڵێ هەبێت ناوی فلپی لێنابێت وە بڵێت ئەوە کوڕی منە، کەس ئەم قسەیە بە ڕاست و هەند هەڵناگرێت، ڕەنگە وەکوو کوڕێک خۆشتبوێت، رەنگە لە ماڵ لەگەڵیشت بژیو نانیش بخوا، ڕەنگە کاغەزی تەبنیشت هەبێت، بەڵام ئەم ماسیە هەر بە ماسیەتی ئەمینێتەوە وە تۆش مرۆڤ. ئەم دوانە بە یەک ناچن وە ئێمە دەزانین پەروەردگار بە هیچ شتێکی ناو گەردوون ناچێت. لە ڕاستی ئێمە زیاتر بە ماسی دەچین نەوەک پەروەردگار. ئێمە سنوردارو دیاریکوو جێی نیازین هەروەک ماسی. کەچی پەروەردگار هەمیشەیی و بێ نیازە. پەروەردگار زۆر دوورە لەوەی منداڵی هەبێت چ بە ڕاستی بێت چ ڕەمزی بێ، تەنها یەک مانای تەواو مەجازی لە خۆ ئەگرێ ئەویش ئەوەیە دایک و باوکمان ئاگایان لێمانە و ڕێمان پیشان دەدەن و پەروەردەمان دەکەن وە هەروەها پەروەردگاریش. بەهەرحال ئەمە بەسەر هەموو دروستکراوێك جێبەجێ دەبێ، نەوەک بەس مروڤ، چ جای تاقە کەسێك.

وە دەربارەی بودایسزمیش هەبوونی پەروەردگار هیچ هەلێکی نیە لە بودایزم، بەمەش بودایزم وەك فەلسەفەیەکە نەك ئاین. وە ئەمەش لەو دۆزیانەی خۆیەوە هاتوە، واتا ئەو ڕوونکردنەوانەی دەربارەی ئامانجی ژیان و هۆکاری ناخۆشی و تەنو چەڵەمە وە ئەو نەزانیە زۆرەی دەربارەی ژیانی پاش مردن بڕۆکەو دەربڕینی مرۆڤن نەوەک خوا. لەڕاستی ئەوەی ئێمە دەمانەوێ شتێکی پێناسەکراوە، وە بەتەئکید تەنها لە زاتێکەوە بۆمان بێت کە زاناتر بێت لە غەیب، ئەویش پەروەردگاری غەیبە، هەر قسەیەکی تر بێجگە لە قسەی ئەو خەملاندنە.

هەندێک ئاینی تر هەن کە دەتوانین ناویان بێنین، بۆ نموونە سیخیزم ئەویش هەروەک بودایزمە لەو ڕووەی بانگەشە بۆ هیچ پەرستراوێکی بنەڕەت ناکات، بەلایانی کەم بە شێوەیەکی تر بانگەشەی خوا پەرستی دەکات پە پێی هەست و بیری خۆیان. دامەزرێنەی سیخیزم (گورو ناناک) ئەوەی بە فکری خۆی پێی باش بوو لە هیندۆزم و لە ئیسلام تێکەڵی کردن و ئاوێتەی کردن بە شێوەیەک کە بەخۆی دەیویست. ئەوە شتێکە ڕەنگە هەندێکمان لە خشتبەرێت بە ڕووبەڕووبوونەوەمان لە باگشەی ئاوا. بەڵام ئەگەر ئاقڵانە بیر بکەینوە کیشەیەك هەیە. ئەگەر یەکدەنگبین لەسەر وەی بەڕاستی وەحی و پەیامێک هەیەو هاتوە لە خواوە، جا چۆن ئێمە هۆشمەندانە ڕابەری پەروەردگار دەست لێ هەڵگرین وە بە دوای شتێکی تر بکەوین یان لەگەڵ شتێکی تر تێکەڵی بکەین. هەڵبەستنی شتێکی ئاوا چۆن بزانین پەروەردگاری ئەم کەونە پێی ڕازیە؟ ڕەنگە کەسێک بتوانی بەپێی بیرۆکەکانی هیندۆ بتوانێ پاساوی بۆ بێنێتەوەو بەڕاستی دابنی، بەلام لە ڕوانگەی ئیسلام و یەهودیاکانەوە زۆر ئاستەم و دوورە.

تا ئێستا ئێمە یەك تاقیکردنەوەمان جێبەجێ کردوە بۆ ئەوەی بزانین بانگەشەی هەر ئاینێک کە دەڵێ لە پەروەردگارەوەیە ڕاستە یان نا: ئایا لەگەڵ بنچینە ئەقڵیەکان یەکئەگرێتەوە کە ئێمە بەهۆیانەوە دەتوانین تێبگەین و بزانین پەروەردگارێکی هەمیشەیی و بێ نیاز و بێ هاوتا هەیە وە جیاوازە و جودایە لە دروستکراوەکان؟ ئایا هیچ پێوانەیەکی تر هەیە جێبەجێی بکەین بەهۆیەوە بتوانین پاڵێوراوەکانمان پێ کورت بکەینەوە؟

## بەدی چوارەم

# تاقیکردنەوەیەکی جیهانی

بێگومان تاقیکردنەوەی تر هەن بۆ ئەوەی بزانین ئەو کەسە ڕاست دەکا یان نا. یەکێک لەوان کە مەنتیقیبێ بیرۆکەی گیشتگیری جیهانێتیە، ئەوەی مەبەستمانە بەوە ئەوەیە ئەو پەیامەی لە پەروەردگارەوە نێردراوە دەبێت گشت گیربێت، بۆ هەموو کەسێک بێت کە توانای ژیریان هەبێت و لە هۆکارەکانی هەبوونی پەروەردگار بگەن وە توانای پرسیاری قوڵ و کاریگەریان هەبێت لەسەر ژیان و مردن و گەردوون و هەموو شتێکی تر. ئەقڵ قەبووڵ ناکات ئەگەر کەسێک بڵێت پەروەردگار ڕێنمیونی تەنها بۆ گروپێکی دیاریکراوی مرۆڤەکان دەنێری ئەوەی تر وەلا بنێ. بێگومان زانستی پەروەردگار بێسنووره لە هەڵبژاردنی کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو بۆ هەڵگرتنی پەیامەکەی وشوێنکەوتنی و بڵاو کردنەوەی وە دەبێ هۆکار و حیکمەتێش لەوە هەبێ کە پەیامەکەی لە ڕێگەی کەسێکی پایە بەرزەوە بەوانی تر ڕابگەیەنێ لە بڕی ئەوەی یەك بە یەك بە هەموویان ڕابگیەنێ. سەرە ڕای ئەمەش، پرسیاری تر بە دوای خۆی دادێنێ : ئەگەر ئێمە لەو گروپە نەبین کە پەروەردگار رێنمونی بۆ ناردوون، دەبێت چی بکەین ؟ چیمان بەسەردا ڕوودەدات؟ زۆر سەیرە کە پەروەردگار هەموو هۆکارێکی پێویستی بۆ هەموو مرۆڤەکان دابین بکات جگە لە پێویستە ڕۆحی و دەروونی و ئەقڵیەیانە نەبێت، ئەویش وەڵامی پرسیارە گەورەکانە.

ئەمەش یەهوودیەت وەلا دەنێ. یەهوودیەت گرنگ و مەزنە کەسێک ئەگەر لە ئافرەتێکی یەهوودی لەدایکبوبیت، بەڵام ئەگەر وانەبیت ئەوا بێ بایەخە، هەرچەندە هەندێک لە ئێمە بە شێوەیەک لە شێوەیەکان ڕای وایە وڵاتەکەی یان ڕەگەزەکەی یان خێڵەکەی یان شارەکەی یان ئەو تیمی تۆپی پێیەی باشترینن یان ڕۆژێک لە ڕۆژان وایان لێدێت، زۆرێک لە ئێمە ئەم بیرۆکەیە بە درۆ دەخەینەوە کە دەڵێ تەنها هەندێ لە قەوم یان ڕەگەزەێکی دیاریکراو ئومێدی نیعمەتی چوونە بەهەشتیان هەیە، وە دەڵێن هیدایەتی ڕاست و ڕاستەقینە تەنها بۆ ئەوانە، بۆ من و تۆ نیە. ئەگەر ئەمە ڕاستیش بێت، ئەوا دەبێت ئێمە وەلای بنێین وەك هەڵبەستراوێک کە هیچ پەیوەنی بە ڕێنموویەوە نەبێت. هەندێ هۆکاری تریش هەن یەهودیەت ئەگەر هۆشدارانە بیری لێ بکەینەوە ئەوە لە بەهای یەهوودیەت دێنێتە خوار. بەڵام ئێرە کاتی ئەوە نیە.

لێرە واباشە ڕاوەستین و کورتە پشویەک بدەین.

هەر لە سەرتاوە پێم گوتی ڕەنگە حەز بەم باسە نەکەی.

به نزیکبوونەوە لە کۆتاییەکانی ئەم ڕێگا ئەقڵیەی هەڵمان بژاردوە ڕەنگە بە تەواوی پێچەوانەی ئەو حەزو خواستانەتبێت لەم ژیانە دەتەوێت، وە ڕەنگە رقیشت لە ڕاستیەکەبێتەوە، وە ئەگەر تۆش لەو جۆرەکاسەنەبیت کە وابیردەکەنەوە ئەم ژیانە باشەو خۆشە ، وە هەمووشتێکم هەیە کە پێویستم پێیەتی. جا من دەتوانم چەندین هۆکارت بۆ بێنمەوە کە ئەم ژیانە تا سەر بۆ کەس نیە هەروا نامێنێتەوە. بەڵام ئەگەر تۆ لەو جۆرە کەسانەبیت ئەوا گوێ بە ڕاستیەکە نادەیت.

## ئاگاداری

ئەو باسەی کە دێ تەنها بۆ کەسانێکە کە کینەو حوکمدانی کوێرانە وەلادەنێت و بڕێك قوڵتر بیردەکااتەوە وە بەدوای کۆتاییەکی ژیرانە دەکەوێت.

تا ئێرە شتەکان بە ئاسانی دەڕۆیشتن. بەڵام ئەوەی کە دێ ڕەنگە کەمێک بەلاتەوە ڕەق بێ کاتێك باسەکە دەگات بە کۆتایی و بڕیاردان . نامەوێ دڵساردت بکەم چونکە ئەم باسە بەڕاستی لایەقی ڕەنجکێشانە بۆی. تا ئێرە شتێك هەبوە کە شایستەی ئەوە نەبووبێت ڕەنجی بۆ نەکێشی؟ ئەو کۆتاییانەی من ڕابەریت بۆ دەکەم کەمێك پێویستی بە ڕەنجە بۆ بەدواداچوون. لە ڕاستی بۆ هەندێکتان ڕەنگە ڕەنجێکی سەختی بوێت.

ئەو ڕەنج کێشانە لاشەیی نیە، بەو ڕادەیەش بیری نیە پێویست بە بیرکردنەوەیەکی زۆر بکات. ئەگەر ڕازی بەوەی ئەقڵ و هۆشت بەکاربێنی تاکوو بگەیت بە کۆتاییەکان. وە ئەگەر ئامادەی بەوەی باشترین هەڵبژاردنە ئەقڵیەکان دیاری بکەیت وە بەلاتەوە گرنگبێت، لەو باوەڕەدام حاڵت باش بێ، هەندێکتان باش نابن. هەندێکتان ئەم کتابە دەخوێنێتەوە رەنگە بە هەموو شتێکی ئەو کتابە قایلبێ و قەبووڵیشی بکات وە دواتر لەو ژیان و کردارانە بەردەوام بێت کە پێشتر لەسەری بوە. یان بە لایەنی کەم هەوڵی خۆت دەدەی. من دەڵێم هەوڵدە هەندێك خۆت ماندووکەو ڕەنج بکێشە چونکە بە بێ ڕەنج هیچ توانایەکت نابێ. من لە ئەزموونەوە قسەئەکەم. ئەوەی کەدێت ئەتگەیەنێت بە کۆتاییەك کە ڕەنگە بۆ هەندێکتان ڕاستەکی ترسناك و کاریگەربێت. وە بۆ ئەوانی تریش ڕەنگە شتێکی چاوەڕوانکراوبێت. ئەوەی کە لێی دڵنیابین ئەوەیە کاتێك درك بە ڕاستیەکە دەکەیت هەرگیز ژیانت وەک خۆی نامێنێتەوە. هەمووکات لەگەت دەبێت، هەرچەندەی هەوڵدەی ڕابکەی ناتوانی لە خودی خۆت ڕابکەی.

## ئاگادارکرایتەوە

با بگەڕێینەوەی بۆ ئەو شوێنەی بەجێمانهێشتبوو....

تا ڕاددەیەکی زۆر ئەوەی پێشبڕکێ کارن لێرە ئیسلام و زەردەشتیە.

هەندێک هۆکار هەن بەوەی بەوەی بۆچی ئیسلام لە زەردەشتی بەرزترە. یەکەمیان ئیسلام ئاینێکی جیهانیە بۆ هەموو کەسێکە، بە پێچەوانەی بیری هەندێ کەس، وە بە پێچەوانەی ئاکاری هەندێک لە شوێنکەوتانی ئیسلام، ئیسلام ئاینێکی عەرەبی، یان پاکستانی یان هیندی نیە، هەر وەك چۆن بۆ خەڵکانێکی ئینگلیزی ڕەنگ سپی بە هەمان شێوەشە بۆ عەرەب و ئەفغانی و ئەسکیمۆییەکان.

ئەوەش ڕوونە کە وشەی ئیسلام وشەیەکی عەڕەبیە مانای تایبەتی خۆی هەیە، چەمکێکی ڕوونە مانای خۆبەدەستەوەدان یان تەسلیمبوون بە پەروەردگار لەخۆدەگرێ. کەواتە موسوڵمان ئەو کەسەیە کە بانگەشەی گوێڕایەڵی و گرتنەبەری ڕێنمونی پەروەردگاری دەکات. وە بانگەشەی ئەوە دەکات کە بنچینەی پەیامی باوەڕهێنان و گوێڕایەڵی بەو خوایە گەورە و بێهاوتایە هەمان بنچینەی پەیامی ئەو پەروەردگارەیە کە هەردەم نێردراوی ناردوە لە لایەن خەڵکانێکی تایبەتی دیاریکراو وەك پێغەمبەرێك یان پەیامبەرێك. ناوی ئاینی ئیسلام نەبەستراوەتەوە بە هیچ شوێن و کەسێکەوە. یەهودیەت( یەهوذا)، مەسیحیەت ( مەسیحی)، بودایزم (بوودا)، زەردەشتی (زەردەشت)، ئەوانە هەموویان بەسرتراونەتەوە بەکەسێك یان شوێنێك. بو نمونە ئەگەر کەسێك لەشوێنێکی دوور ژیابێت قەت گوێی لە ناو عیسا نەبووبێت کە خوایەو کوڕی خوایە (بەپێی بۆچوونی مەسیحیەکان) کە لە پێناوی تاوانی کەسانی تر مردوە. ئەمە مەحاڵە کەسێك درك بەمە بکات لە ڕێگای ئەقڵەوە یان لە ڕێگای ئەزموون. قەت بە ئەقڵ ناتوانی درکی پێ بکەی. دەبێ کەسێك پێت ڕابگەیەنێ. ئەم کێشەیە لە ئیسلامدانیە. بیرو باوەڕی سەرەکی لە ئیسلام ئەوەیە کە پەروەردگارێکی بێهاوتا هەیە کە دەبێ بەدوای ڕابەریەکەی بکەوین. ئەم بیرو باوەڕەش هەرکەسێك لە هەرشوێنێك دەتوانێ درکی پێ بکات. وەك بیرۆکەیەک ئیسلام خۆبەدەستەوەدان بۆ خوای تاك و تەنیا بەڕاستی جیهانیە

# بەندی پێنجەم

## تاقیکردنەوەی کەسایەتی

هەندێ تاقیکردنەوەی تر هەن دەتوانیین جێبەجێیان بکەین.

یەکەمیان بەستراوەتەوە بە کەسێتی و ڕەوشتی ئەو کەسەی بانگەشەکە دەکات. ئەگەر ئەو کەسەی بانگەشەی پەیامێك دەکات لە لایەن پەروەردگارەوە، نیشانەی ناسراوێتی و ڕاستییێتی و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی، قەبووڵکردنی ئەو کەسە ئاسان دەکات، وە قەبووڵکردنی ڕاستییێتی ئەو پەیامانەی لە لایەن پەروەردگاریەوە وەریگرتوە. بە دلنیاییەوە دەکرێ ئەو کەسە هەڵخەڵەتێراوبن، وە وادەزانن ئەوان ڕاست دەکەن دەربارەی ئەو بانگەشەیەی دەیکەن وە وا هەست ئەکەن ئەون ڕاستگۆنە بەڵام ئەزموونەکەیان بەرهەمی هەندێ نەخۆشیو لادانی ئەقڵی و وڕێنە کردنە. جا چۆن بزانین کە ئەمە ئاوا نیە؟

بە دڵنیاییەوە کەس لە ئێمە نایەوێ هەڵبخەڵەتێنرێ یان فێڵکەرێك بە لاڕێی ببا یان بە دوای گێلە پیاوێک بکەویت. بە دڵنیاییەوە فێڵکەری زیرەك هەر شتێك لە توانای داهەبێ دەیکا تاکوو وات لێ بکا باوەڕی پێ بکەی و بە ڕاستگۆو خەم خۆری دابنێی، وە زۆریش خۆیان وا دەنوێننن وەك ئەوەی کە ڕاستی بێ، وە بەزۆری ا بە پێشکەشکردن فریوت دەدەن کە وای لێ دەکات زۆر چاك و ڕاست گۆ دیاربێت. کێشەکە لێرە ئەوەیە لەو شوێنەی کۆتاییمان پێ هێنا خاڵی دەستپێکردنەوەیە. وا پێدەچێ هەموو هەوڵو کۆششەکانمان وەك کەسایەتیەکی باوەڕپێنەکراو کۆتایی بێت، بەڵام مەبەست لێرە ئەوانەنین کە بانگەشەی ڕاست و دروست دەکەن. ئەوە موساو عیساو موحەمەد (صل الله علیهم و سلم) و زەردەشت و بودا نین بەخۆیان لەدەرگامان بدەن، ئەوە ئەو خەڵکانەن بە نوێنەرایەتی وان قسەی وان دەکەن. جا بەر لەوەی ئەو کەسایەتیانە تاقی بکەینوە پێویستیمان بە هەبوونی چەند بیرۆکەیەکە بۆ زانینی ڕاستییێتی گوتەی ئەوان ڕەنگە پێچەوانەی ئەوە بێت کە خەڵك بانگەشەی ئەوە دەکەن کە قسەی ئەوانە.

جا لەبەر ئەمەیە دەقی ڕاست (صەحیح) زۆر گرنگە. کێشە لەگەڵ زەردەشتیەت ئەوەیە هیچ دەقێکی دروستی قسە و نووسینەکانی زەردەشت نەماوەتەوە.تەنیا دروشمە ئاینیەکان وهەندێك بیرۆکە دەربارەی لاهووتیەت. بەڵام وتە ڕاستەکانی بە نزیبکەیی هەمووی لەناو چوە. کێشەکان لەگەڵ ڕاستییێتی ئینجیل زۆر ناسراون تەنانەت لە لایەن زانا مەسیحی و یەهوودیە ڕاستگۆیەکانیش دیار و ڕوونە. لەم ڕووبەرە قورئان لە هەموویان جیاوازە. مشتومڕێکی زۆر زۆر بچووک هەیە لەسەر ڕاستییێتی نوسراوی قورئان. لە ڕاستی کەسێك نوسخەیەکی قورئان لە هەر مزگەوێکی دونیا هەڵگرێ و بەراوردی بکات لەگەڵ ئەو دەست نووسەی کە تەنیا سی

ساڵ لە دوای پێغەمبەر نووسراوەتەوە کەهیچ شتێکی نەگۆڕاوە، تەنها ستایلی نووسینەکە گۆڕاوەو بە دانانی نیشانە لە هەندێك شوێن ئەویش بۆ ئاسانکاری خوێندنەوە. ئەوەش شتێکی سەیرە بۆ نوسراوێك پێش چواردە سەدە نوسرابێتەوە. سەرەڕای ئەو نووسینە نایابە تۆمارکراوە بە پارێزراوی پێمان گەیشتوە، بەهەمان شێوە بە زارەکیش پارێزراوە و پێمان گەیشتوە. موسوڵمانەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن پەڕتووکە پیرۆزەکانی تر بە ڕێگای جیاواز گۆڕانکاریان تێدا کراون و شێوێندراون و لێیان کەم کراون و ونبوونە، بەڵام پەردوەردگار (کە قورئان وتەی ئەوە) پەیمانی داوە قورئان بپارێزێت چونکە کۆتا پەیامە لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤایەتی وە موحەمەدیش (صل الله علیه و سلم)کۆتا پێغەمبەرە. لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکانش مرۆڤن قابیلی هەڵەکردنن، هەڵەیوان دەلالەت ناکەتە سەر ڕووی ڕاستەقینەی ئاینی ئیسلام.قورئان و سونەتی پێغەمبەر بە ساغی ماونەتەوە بۆ خەڵك تاکو بتوانن ڕێگەی هیدایەتی ڕاستەقینەی خوا بدۆزنەوە.

ئەوە ئەوەیە کە موسوڵمانەکان دەیڵێن، بەڵام ئایا لەگەڵ ئیسلام کێشە هەیە؟

مەبەستم ئەوەیە چۆن کەسێك لە شوێنێکی ئەم دونیا پێشکەوتوو و ئازادە یان لە هەر شوێنێکی تر بە دوای ئاینێك دەکەویت کە تەمەنی ١٤٠٠ ساڵ بێت؟ وا پێدەچێ ئافرەت وەك چینی خواروو هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت (بەڵام ئافرەت لە وڵاتە پێشکەوتوو و ئازادەکان هێشتا دراوی کەمتری پێدەدرێ لە پیاوێك بۆ هەمان کار، وە ڕێك وەك ئالەتێکی سکس وەسف دەکرێت، بڕێکی زۆریان ئازار دەکێشن تۆقیون لەبەر توندو تیژی جنسی و ئازاردانی جەستەیی وە مەحاڵە وەك دایکێك یان خێزانێك ڕێزی لێ بگیرێ، بە لایەنی کەمدەبێ لەم دونیا پێشکەوتوە دەبێ بڵێین ژن و پیاو یەکسانن.) مەبەستم ئەوەیە قورئان گوتویەتی لە خێزانەکەت بدە لە هەندێ حالەت! پیاو دەتوانێ چوار ژن بێنێ وە جاریەی بێ حیسابی هەبێ! وە میرات دوو ئەوەندەی ژن وەردەگرن، وە دوو ژن بە شایەدێك هەژماردەکرێت.

ها ئەوەتا پیشەی جیهاد و ئەو هەموو تیرۆرە `` شەڕ لەگەڵ بێباوەڕەکان بکەن و بیانکوژن لە هەر شوینێك کە دیتتانن`` [1]

وە چی دەربارەی ئەو یاسا دڕندانە بەرچاوانەی وەك دەست بڕینی دز و کوشتنی هەڵگەڕاوو زیناکارەکان (وە چۆن هەموو جارپێدەچێ ئافرەتەکە بکوژرێ؟) و کوشتنی نێربازەکان وقامچی لێدانی سەرخۆشەکان وە لەخاچدانی ڕێگرەکان!

---

[1] هەرچەندە ئەو گومانانەش ئاوانین کە هەندێك لە نەیارانی ئیسلام ئاوای لێ دەدەنەوە، ئەم کتێبە وەڵامدەنەوەی گومانەکان نیە کتێبی تر هەن دەتوانن بەدەستیان بێنن بۆ وەڵامی ئەو گومانانە

ئایا قورئان وەکوو هەر پەڕتووکێکی تری ئاینی نیە پڕ بێت لە دژیەکی و دەستەواژەی ئاڵۆز وە کراوەیە بۆ لێدانەوەی ئاڕاستە جیاواز؟

جا قورئان وەکوو هیچ پەرتووکێکی ئاسمانی نیە بە لایەنی کەم لە ڕووی پارێزراوی و ڕاستەقینەیی (صحیحی). جا دیسان چەند لەو کێشانەی خەڵک هەیانە لەگەڵ ئیسلام بەڕاستی ئەو کێشانە کیشەی پێچەوانەیی ڕێبازی قورئان و پێغەمبەرە لەگەڵ هەڵسوکەوتی موسوڵمانەکان.

با بە ئاقڵانە تەماشای ئەم مەسەلەیە بکەین نەوەك بە هەست و سۆزەوە.

ئایا کاتێك قورئان هەندێ شت فێردەکا کە پێچەوانەی نەریت و خووڕەوشت و بنچینانەیە ئێمە لەسەری ڕۆیشتوین، ئایا ئەوە مانا وایە کە لە پەروەردگارەوە نیە؟

لە ڕاستی لەسەر ئەو مەسەلانەی لەوەو پێش باسکران هیچ هۆکارێکی ئەقڵی نیە ڕێێ بە ئاسمانی بوونی قورئان بگرێت. جا ئەی ئەگەر لەگەڵ ژیانی مۆدێرنی ئێستا گونجاوو لەبار نەبوو؟ ڕەنگە پەروەردگار حەز بەو بیرۆکە مۆدێرنە مرۆڤیانە نەکا، من ناڵێم ئەوە کێشە سەرەکیەکەیە، من تەنها دەمەوێ ئەو خاڵە بسەلمێنم کە دیسان ئەمە هۆکارێکی ماقوڵ نیە بۆ ڕەتکردنەوەی قورئان کە لە پەردوەرگارەوە نەبێت. بەم هەڵسەنگاندنەوە بە نزیکەیی هەموو ئاینەکان دێنە پاڵ ئیسلام لە پرسیارکردن لە ڕەوایی ئەو شێوازە ژیانەی لە سەر مادیگەراییەکی پەتی دامەزراوە وە ڕابواردن ڕەفتار و ڕەوشتی گەلێك لەو ژیانە مۆدێرنە ڕوون دەکاتەوە.

کێشە لەگەڵ دادگایی کردنی هەر کتابێکی دیاریکراو یان ئاسمانی تەنیا لەسەر ڕەوشتەکان و یاساکان، ئەو یاساو ڕەوشتانە بە گشتی دوورن لە جیهانی. بۆ نموونە شتێك یاسایەک ڕەنگە سزایەکی توند و ڕەق بێت بە پێی کلتورێك بەڵام بە پێی کلتورێکی تر نەرم بێت. سنوردارکردنی چەندژنێتی ڕەنگە بە پێی کۆمەڵگایەك بەستن و تەسککردنەوەبێت کە پشت بە هەوسەرگیری دەبەستێت وەك ڕێگایەك بۆ پاراستنی باری کۆمەلایەتی ئافرەتێك و ڕێگە گرتن لە فرەژنێتی بێ سنوور. بۆ ئەو کۆمەڵگایە تاك ڕەنگە ژنێتی شێتی بێت، بە تایبەت بۆ ئەو ژنەی پشت بە چەندژنێتی دەبەستێت بۆ پاراستن. جیهانی پێشکەوتووی ئازادی خۆ تێهەڵکێش خۆی لە خۆی دا بە بەردەوامی لە زۆر شتەوە هەڵوێستی خۆی لەسەر بەها ڕەفتار و ڕەوشتیەکان دەگۆڕێت. ئەوەی کە دە ساڵ بەر لە ئێستا بە خراپ دائەندرا ئێستا بە باش دەدەندرێ، وە بە پێچەوانەوە، هێشتا هەندێ لە وتەبێژەان بۆ بەهای جیهانی ئازاد باس لە بەها ڕوشتیەکانی خۆیان دەکەن، وەك بڵێی ئەو بەها ڕەوشتیانە جۆرێکن لە نوسراوی خوایی بە دڵنیاییەوە وانیە و پێچەوانەکەی ڕاستە.

مەبەست لێرە ئەوەیە گەورەترین کێشە کە خەڵک وا دادەنێن هەیانە لەگەڵ ئیسلام بەڕاستی بە دڵنیاییەوە پێوەرێکی دادوەری ڕەواییانە نیە حوکمی بەسەرەوە بدەیت. کەسی هۆشمەند دەبێت ئەو هەڵوێستەی هەبێت کاکتێک کە یەکێك بۆی بە بەڵگەوە دەسەلمنێت دڵنیای دەکات کە ئەم کتێبە لە خواوە هاتوە، ئەوە دەبێ ئەوەس قەبووڵ بکات کە پەروەردگار بەخۆی دەزانێ چی باشترینە بۆ ئێمە، لە ڕاستی مرۆڤەکان ئە و یاساو ڕەفتارنە هەڵدەبژێرن کە لەگەڵێ ئاسوودەن نەوەك ئەوانەی باشن و بەکەڵك و سوودن بۆیان، یان هەندێ لەو مرۆڤانە( ئەوانەی خاوەن دەسەڵات وهێزن ) سیستەمێکی ڕەوشتی وا دادەمەزرێنن بۆ وڵات کە بە هۆیەوە لە دەسەڵات بمێننەوە! ڕاستیەکەی ئەوەیە زۆرشتی باش هەیە بۆ ئێمە کە ئێمە حەزمان لێی نیە وە زۆر شتێش ئێمە حەزمان لێیەتی بەڵام بۆ ئێمە خراپە. جا ئێمە دەبێ مەسەلەی نەگونجانی ئیسلام لەگەڵ ژیانی مۆدێرن بە مەسەلەیەکی ناڕاست و ناڕێک دابنێین وەك پیاوێکی تری دەرپێ سوور تەماشا بکرێ.

نا ڕەنگە ئێستا کاتی قوت دانی تاڵ و تفترین حەب بێت. کاتی قەبووڵکردنی شتێك ڕەنگە بۆهەندێك لە ئێمە سەختترین ڕاستی بێت؛ ئە ویش قەبولکردنی ئەو ڕاستیەی کە قورئان تاکە سەرچاوەی ڕێنموونییە کە لە پەردوەرگارەوەبێت، وە موحەمەمەدیش پێغەمبەربێت، بە لایەنی کەمەوە دەبێ ئەو کینەیەی لە دڵماندایە لایبدەین و بە دڵێکی خاوێن ساف و فراوانەوە بڕوانینە ئەو مشتومڕە ماقوڵانەو لێیان بکۆلینەوەو بەکاریان بێنین پشتگیری لە بانگەشەی ڕێنمویی قورئانی پێ بکەین. دوای هەموو شتێك هەندێك خاڵ هەیە لەسەرپشتگیریی لەو بانگەشەیە دەکات. یەکەمیان هەر شتێک قورئان باسی کردوە دەربارەی پەردوەرگار یەکدەکاتەوە لەگەڵ هەرتێگەیستنیکی مەنتقیانە لە لایەن هەموو کەسێکەوە لە هەموو شوێنێکەوە. بۆ نمونە یەک پەردوەردگارهەیەو جیاوازە لە درستکراوەکانی. زۆر ئایەت هەن لە قورئان ئەو ڕایە ڕوون دەکەنەوە. بۆ نموونە سوڕەتی ئیخلاص

قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ بڵێ: ئەوە خوای تاک و تەنیا. ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ ئەو خوایەی بێ نیاز و جێ ی نیاز و ئومێدە. لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووە. وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤ وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نی یە. (تەفسیری پوختە)

هەندێ کەس پرسیار لە بەکارهێنانی وشەی (هو ) ئەو بۆ نێر لە قورئان دەکەن. ئایا ئەوە مانای وایە پەروەردگار نێرە؟ بە پێی ئەم ئایەتانە خوا لە هیچ شت و کەسێ ناچێ. لە زمانی عەرەبی، زمانی بنچینەیی قورئان وەکو زۆر لە زمانەکانی تر تەنها ڕاناوی نێر و مێی تیدایە ڕاناوی

بێلایەن لە نێرو مێیەتی بوونی نیە. بگرە لە ئینگلیزیش شیاو نیە ( it) بۆ خوا بەکاربهێندری. (هو) لە قورئان بۆ دیرایکردنی جنسیش بەکار هاتوە، بەڵام لەکاتی بەکارهێنانی ئەو ڕاناوە بۆ خوا بە مانای نێر بەکار نایەت.

خالی دوەمی پشتگیریکاری ئیسلام پارێزراوی قورئانە بە شێوەو شێوازێکی سەیر. مێژوی ئەم پارێزراویە پێویستی بە کەمێك خوێندن هەیە، بەڵام بە کورتی هەندێك باس و لێدوانانی هەندێك لە توێژەرانتان بۆ دێنمەوە بۆ نموونە:

**ڕیچارد بۆرتۆنی** [٢]خۆرهەڵات ناس نوسیویەتی ئەو قورئانەی ئێستا لەبەردەستمانە هەمان ئەو نوسین و شێوازەیە کە بەو بۆمان هاتۆتە خوار و ڕێکخراوەو نوسراوەتەوە لە لایەن پێغەمبەر. ئەوەی لەناو دەستمانە هەمان نوسراوەیە کە پێشتر لەسەدەمی موحەمەد نوسراوەتە. **کێنیث کراگ**[٣] کە قەشەو ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەمریکیە باسی گەیشتن و بڵاوبوونەی قورئان دەکات لە سەردەمی وەحیەوە تاکوو ئەمڕۆ کە بە پرۆسەیەکی زیندوی دڵسۆزانەی یەک لە دوای یەکەوە هاتوە. **سکواڵی** [٤]ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانیە لە کتێبی مێژوی قورئان دەڵێ، ئەوەندەی بەشە جیاوازەکانی وەحی جێگای بایەخن ئێمە دڵنیان نوسراوەکەیان بە گشتی دەقاودەق وەکو خۆی گواستراوەتەوە هەروەك لە پێغەمبەرەوە ڕاسپاردەکراوە.

ئەوان بە دلنیاییەوە باوەڕیان وایەو هاوڕاو پشتڕاستن لەسەر ڕاستەقینەیی ( صحیحی ) قورئانەوە.

هۆکاری سێیەم کە ئێمە دەبێ بایەخی پێ بدەین و تێبینی بکەین ئەوەیە ئیسلام بەنگەشەی بە جیهان بوونی پەیامەکەی دەکات واتە بۆ هەموو کەسێکە بێ گوێدانە رەگەز و پایە. وە بە دڵنیاییەوە ڕوونی کردۆتەوە کە پەردوەردگار تەماشای ڕوخسار و ڕەنگ و هۆز و سەروت و پایەی کەسەکان ناکات بەڵکوو تەماشای دڵ و کرداری چاکی کەسەکان دەکات.

بەهەرهاڵ قورئان بێ مەبەست نیە . ڕەنگە تێگەیشتنی گرانبێت لەبەرئەوەی بە ڕیزبەنی باسی ڕوداو و بابەت و سەرباسەکان ناکات. هەندێ جار ئایەتەکان زۆر دووبارە دەبنەوە. بۆ ئەوەی

[٢] ڕیچارد بۆرتۆن خۆرهەڵاتناس و گێریدەو وەرگێرو سەبازێکی بەریتانیە لە ساڵی ١٨٢١ لە دایك بوە وە لەساڵی ١٨٩٠ کۆچی دواییکردوە. لە بەناوبانگترین وەرگێرانی حەکاتەکاانی (ألف ليلة وليلة) هیە.
[٣] کێنیث کراگ قەشەو زانایەکی مەسیحی ئەمریکیە لە ساڵی ١٩١٣ لە دایك بوە لە ساڵی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کردوە زۆر شتی لەباری مەسیحیو موسوڵمانان گوتووە
[٤] فێدریچ سکواڵی ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانیە لە ساڵی ١٨٦٣ لەدایك بوە وە لە ساڵی ١٩١٩ کۆچی دوایی کردوە. وە پرۆفیسۆر بوە لە زانکۆی ستراسبێرگ.

لێی تێبگەی بەناچاری دەبێ بیری لێبکەیتەوە، وە پەردوەردگار لە قورئان داوامان لێ دەکات کە زۆر بیر بکەینەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا پەیامی بنچینەیی زۆر ڕوونە. تەنها یەك خوا هەیە کە میهرەبان و بە بەزەییە لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانی بەڵام بەتایبەتی لەگەڵ ملکەچ و باوەڕدارەکان. وە توندە لە سزادان لەگەڵ ئەوانەی لووت بەرزو لەخۆباییینەو ڕاستی ڕەت دەکەنەوە. ژیان تاقیکردنەوەیە لەو کاتەی ئێمە دمرین و ئەم گەردوونە کۆتایی پێ دێ ڕۆژێك دێت دیسان لاشەمان زیندوو دەکرێتەوە و دادگایی دەکرێین جا یان پاداشتی هەتاهەتایی یان سزادانی هەتاهەتایی دەدرێین.

پێتشتر پێم گوتی هەندێك بابەت دێن حەزی پێ ناکەیت وەك مردن و جەهەنەم ، بەڵام ئەگەر ئێمە حەز بە شتێك نەکەین مانای وا نیە ئەو شتە ڕاست نیە.

ئایا هیچ شتێکی تر هەیە کە ڕەنگ بێ یارمەتیمان بدات لە قەبووڵکردنی ئەوەی قورئان لە پەردوەردگاری ئاسمانەکان و زەویە؟ جا قورئان خۆی هەندێ جۆری تاقیکردنەوەی قسەهەڵبەستنمان پێ دەڵێ. لە ڕاستی ئەوە تاقیی کردنەوەکی باشە تاکوو جێ بە جێی بکەین لەسەر هەر کتێبێك کە بانگەشەی ئەوە بکات کە لە پەروەردگارەوەیە:

أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا

(An-Nisaa :82)

ئەر قورئان کاری غەیری خوا بوایە نارێك دەبوو: {أفلا يتدبرون القرآن} ئاخۆ ئەو دووڕووانە بۆچی لەماناو مەبەستی قورئان وردنابنەوە کە چەندە وردو پڕحیکمەتە، هەتا باوەڕ بێنن {ولو كان من عند غير الله} خۆئەگەر لەغەیری خوا بووبا {لو جدوا فية اختلافا كثيرا} بێگومان شێواوی و دژایەتییەکی زۆریان -لەرووی رەوانبێژی و خۆشخوانیی و ماناو مەبەستەوە- تیا بەدی ئەکرد، بەڵام چونکە فەرموودەی خوایە، دەبینی لەهەموو کەم و کورتیی و ناتەواوی ودژایەتیەك دوورە.(تەفسیری ڕامان)

مەبەست لێرە ئەوەیە ئەگەر کتێبێك لە پەروەردگاری هەموو شتەکانەوە بێت، زاتێك کە دەبێ دانا و کار بەجێ بێ و زانابێت بەهەموو شتێك، لە ئاستێك دوور لە تێگەیشتنی ئێمە. بە دڵنیاییەوە هەموو کەسێك چاوەڕێی ئەوە لە پەروەردگاری جیهانیان دەکات کە زانایە بە گوزەرانی دنیاو گەردوون، وە ڕووداوو مێژووی مرۆڤەکان. زاتێك کە ئەو سیفەتانەی هەبێت ئەوە هەر پەیامێك لەوەوە بۆمان بێت دەبێ بە بێ دوو دڵی قەبووڵی کەین و ملکەچی فەرمانەکانی پەیامەکەی بین.

ئەوەی جێی سەرنجە لە قورئان تەنها ئەوە نیە کە هیچ شێواوی و دژیاتیەکی تێدانیە لە هەموو روەکانەوە، بەڵام ئەوەی زیاتر جێی سەرنجە ئەوەیە فەرمایشتی دەربارەی مێژو و ئاینزانی و فەلسەفە و یاساو سروشتی جیهان تێدایە کە بەرنگاری ڕاڤەی مرۆڤەکان دەبێتەوە.

خالیکی تری سەیر ئەوەیە قورئان هەتاکوو ئێستاش راوەستاوەتەوە بەرامبەر هەر پارچە نوسراوێکی ئەدەبی لە زمانی عەرەبی. قورئان خۆی بەرەنگاری عەرەبەکان بۆتەوە کە لە شعر و زمانەوانی کارزان و پسپۆڕ بوون بەوەی کە تەنها سوورەتیک بێننەوە وەك قورئان، وە بچوکترین شوورەت تەنها سێ ئایەتە، لەوکاتەی شاعیرەکان پێشەنگی عەرەبستان بوون، موحەمەد (صل الله علیه وسلم) هیچ توانایەکی شعری پیشان نەدابوو نە لە پێش نە لە دوای سرووشی قورئان. قسەو گوتارەکانی پێغەمبەر لە ڕووی زمانەوانیەوە زۆر بە ئاسانی لە قورئان جیا دەکرێنەوە. زۆر لە شاعیرو وتاربێژە لێهاتوەکانی دانیان بەوە ناوە کە ئەوە قسەی موحەمەد(صل الله علیه وسلم) نیە، بەڵکوو ئی مرۆڤ نیە. زۆریان بوون بە موسوڵمان تەنها بە گوێگرتن لە خوێندنەوەی قورئان. بۆ ئەوان ئەوە قەناعەتپێکەرترین بەڵگە بوە بۆ ئەوەی بڵێن کە لە خواوەوەیە. بە دڵنیاییەوە ئەمە گرانە بۆ ئێمە تاکوو قەبووڵی بکەین لەبەر ناشارەزاییمان لە زمانی عەرەبی، بەڵام هەر بە بەڵگەی مێژوویی ماوەتەوە. پرسیارەکە وەك خۆی ماوەتەوە چۆن کەسێك کە هیچ تواناو بەهرەیەکی شعری نەبوە توانیویەتی نوسراوێکی ئاوا بنوسێ کە تاکوو ئێستا لە زمانی عەرەبی هەر بە بەرزیو گەورەیی مابێتەوەو لە کاتێك بەهێزترین نوسراوی شعری لەو سەردەم ئە نوسراون. ئەگەر یەکێك بەراوردێکی تازەو نوێ بکات، سیرەو لە ئەندازە بەدەرە کەسێکی نەخوێندەوار دوور لە زانیاری زانستی یان پەروەدەی زانستی بیرۆکەی فیزیایی بێ خەوش و یەك گرەوە ڕوون بکاتەوە.

موحەمەد (صل الله علیه وسلم) هەروەك زۆرینەی خەڵکی عەرەبستانی ئەو کات نەخوێندەوار بوو. هیچ ڕێگایەکی نەبوو بۆ بەدەست هێنانی هۆکاری پەیداکردنی زانیاریەکی ئاوا مەزن. بەڵنیاییەوە بەرەنگارەکی هەمیشەییە بوە دەربارەی لەکوێوە ئەو هەموو زانیاریەی دەست کەوتوە.

بۆ ئەو دژانەی بە درێژایی مێژوو قورئانیان ڕەتکردۆتەوە کە لە پەروەردگارەوەبێت. هەندێ مەسیحی مشتومڕکەر ئەوندە دوور ڕۆیشتوون بانگەشەی ئەوە دەکەن کە موحەمەد (صل الله علیه وسلم) بەخۆی مەطڕانێکی هەڵگەڕاوە بوە ڕای کردوە بۆ عەرەبستان، هەندێکی تریان دەڵێن لە قەشەیەکی دابڕاو فێربوە! بەهەر حاڵ سەرەڕای هەبوونی مێژوێکی دەوڵەمەند و نوسراوی زۆر لەبارەی ژیانی پێغەمبەرەوە، چۆن کەس نەیتوانی ئەو کەسایەتیە بدۆزێتەوە وە چۆن توانیویەتی بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ ئامۆژگاری پێغەمبەری کردبێت و بە شاراوەیی مابێتەوە. بابەتێکی ترکە ئەمە بەرزی دەکاتەوە ئەوەیە پێشنیاری ئەوە دەکەن کە قورئان

داهێنراوه و موحەمەد (صل الله علیه وسلم) ڕاستی نەگوتوه، بانگەشەی ئاوا زۆر کێشاوین لە کاتێك خوێندنی ژیانی موحەمەد (صل الله علیه وسلم) زۆر بە ڕوونی دڵسۆزی و ڕاستگۆیی تەواوی ئەو پیشاندەدات. ئەو هیچ بارێکی دەروونی کەسایەتیەکی هونەی فیڵبازی تێدا بەدی ناکەی هەرگیز. ئەمەش وای لە هەندێ کەس کردوە بڵێن ئەو فێڵی لێ کراوەو شێت بوە، کە ئەو باوەڕی وا بوە بۆتە پێغەمبەر، دواتر توانیویەتی قەناعەت بە خۆی و ئەوانی تربێنێ.

ئەمەش بەجێمان دێڵێ لەگەڵ نهێنی ڕوونەکراوی زانیاریە سەرنجڕاکێش و فراوانەی زانست کە قورئان لەخۆی گرتوە.

جا ناکرێت کەسێك هەڵخەڵەتێنراوو ناڕاست گۆبێت لە هەمان کات دا.

ئەگەر تۆ وا بیربکەیتەوە کە پێغەمبەری وە بەڕاستی باوەڕت بەوەبێت کە زانیاری لە خواوە بەدەست دێنیت، کاتێك کەسێک هات و پرسیارێکی گرانی لێ کردی، هەروەك لە پێغەمبەر کراوە، ناچیتە لای نزیکترین ڕابی یان قەشە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیرەکە بەدەستبێنی. قەناعەتت وایە خوا پێت دەڵێ.

ماقوڵترین دەرەنجام کە هەردوو دیاردەی بەرزی ئاستی زانیاری سەرنجڕاکێش و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی ئاشکرای موحەمەد (صل الله علیه وسلم) لێکبداتەوە و ڕوون بکاتەوە هەر ئەوەیە کە نێردراوی خوایە. پێدەچێ ئەمە تاکە لێکدانەوەی ماقوڵانەبێت بۆ زانیاری نێو قورئان، لەبەرەوەی ئەم زانیاریە لە پەروەردگارەوەیە. ئەمەش پاڵپشت و سەلمێنەریەتی. دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و بێ پێچ و پەناو پاکی ڕەوشتی پێغەمبەر موحەمەد (صل الله علیه وسلم) ڕوونکەرەوەو سەلمێنەری باگەشەکەیەتی، کە بە دڵنیایی وەرگر و هەڵگری پەیامی خوایە.

## بەدی شەشەم

## ئاستی زانیاری سەرسام کەر

ڕەنگە هەندێکتان لەوانەیە بیر بکەنەوە ئاسی زانیاری سەرسام کەر دەبێ چ بێ کە من باسی لێوە دەکەم، وە ئەمە خۆی لە خۆی دا بابەتێکی گەورەیە ڕەنگە چەند جلدێك لە خۆبگرێ، وە دەبێ هەموو گفت و گۆو مشت و مڕە هەڤدژەکان تیا کۆ بکەینەوە، بەمەش چەند جلدێکی زیاتری دەوێ. لێرە تەنها هەندێك شت هەڵدەبژێرم کە دڵفرێن و قەیلکەرە.

یەکەمینیان زانیاری مێژووییە. زۆر لە مەسیحیەکان هەوڵیان داوە پێغەمبەر بەوە تاوان بار بکەن کە لە ئینجیل شتی وەرگرتوە، وە لەبەر هەندێ هۆکار ئەو بانگەشەیە گێلاتیە، یەک لە هۆکارەکان لەو سەردەم ئینجیل بەعەربی نەبوە، وە ئەگەر هەشبا خۆ پێغەمبەر نەخوێندەوار بوە. هەندێك ناوو کەسایەتی هەن لە قورئان لە ئینجیلیش دا هەن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە زۆربەیان پێغەمبەرو نێردراوی خوان، قورئانیش کۆتا پەیامی پەروەردگارە لێکدانەوەی ژیانی ئەو بە نموونە هێنانەوەی شایەنی باسکردنە بۆ وروژاندن و هاندانی باوەڕداران. سەیر نیە باسی ئیبراهیم دەکات لە کاتێك عەرەب بە باپیرە گەورەی خۆیانی دەدەنێن لە ڕێی کوەرەکەی ئیسماعیل. یەکێك لە زاراوە ئینجیلی کە بۆ عەرەب بەکار هێنراوە ئیسماعیلیکانە لەبەرئەوەی ڕەسەنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو. ئەوەی جێی سەرنجەو قابیلی ڕوون کردنەوەیە ئەوەیە کە لە قورئان زۆر باسی موسا پێغەمبەر کراوە. ئەوە ش لەبەر ئەوە بوە موحەمەد پێغەمبەر سپاردە و بەرەنگاریکانی زۆر لە هی موسا پێغەمبەر دەچێ، وە ئەزموونی پێغەمبەر عیسا ڕێنمویەکی بەسوود و هاندەر بوە بۆ پێغەمبەری کۆتا زەمان.

دوو گێڕانەوەی کاریگەر کە لە چیرۆکەکانی ناو قورئان وەرگیراون.

یەکەمیان، سەرنجڕاکێشە چۆن یوسوف پێغەمبەر ناوی لە قورئان هاتوە و هەرگیز بە فیرعەون ئاماژە بە فەرمانڕەوای مەصر ناکات، بەڵکوو بە پاشا ناوی دێنێ، لە کاتێك مووسا بە ڕوونی مامەڵە لەگەڵ فیرعەون دەکات. کیتابی موقەدەس بە هەردوکیان دەڵێت فیرعەون. ڕەنگە بڵێن ئەوە کێشەیەکی گەورە نیە، بەڵام کاتێك بە شوێن سەربوردەی یوسوف دەگەڕێین لە مێژوو دەبینین بنەماڵەی هیکۆسیەکان لە بنەڕەت مصری نەبوون سامی بوون بۆیە وشەی فیرعەونیان بەکار نەهێناوە. بەڵام خەڵکی مەصر وشەی فیرعەونیان بۆ فەرمانڕەواکانیان بەکار هێناوە. بەڵام فەرمانەاکانی سەردەمی مووسا لە خەڵکی مصر بوون جێی هیکۆسیەکانیان گرتەوەو دەستیان بە زوڵم کرد لە دژی نەوەی ئیرائیل. ئەگەر موحەمەد لە کتێبی موقەدەس وەرەیگرتبێ ئەی چۆن ئەم هەڵە مێژووییەی نەگاستۆتەوە. وە ئەو زانیاریە دروستەی لە کوێ دەست کەوتوە؟

لەو کات هیچ کۆلێژ و بەشێك نە بوە لە سەر شوێنەوارناسی مصری. زانستی خوێندنەوەی هیرۆگرافی چەن سەد ساڵێك بەر لە هاتی پێغەمبەر ون ببو. وە دەست نەکەوتەوە تا دۆزینەوەی بەردی ڕۆزێتا ئەویش هەزار ساڵ دوای پێغەمبەر بوو. ئەمەش وادەکات بەشی دوەمی زانیاریەکە دڵڕفێنتر بێت.

قورئان چیرۆکی موساماں بۆ دەگێڕێتەوە چۆن چۆتە لای فیرعەون و بانگی کردوە باوەڕ بە خوا بێنێ. وە فیرعون چۆن پرسیاری لە موسا کردوە دەربارەی خوای نەبینراوی سەرووی ئاسمانەکان. وە فیرعەون خۆی بە خوا ئەزانی. وای ئەزانی لە ڕێگەی سحر ئەتوانی فرمان بە خواکان بکات. بە لووتبەرزیەوە بە یەکێك لە پیاوەکانی گوت:

((وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ)) (Ghaafir :36, 37)

دەڵێڕێگاکانی (بەرز بوونەوەن بۆ) ئاسمانەکان بۆ ئەوەی (لەوێوە) سەیری خواکەی مووسا بکەم وە بەڕاستی من وا گومان دەبەم ئەو (مووسا) درۆزنە ئا بەو جۆرە ڕازێنرایەوە بۆ فیرعەون کردەوەی خراپی وە (بە هۆیەوە) بەرگری کرا لە ڕێگای ڕاست وە هەر فێڵ و پلانێکی فیرعەون هەبوو بە فیڕۆ چوو.(تەفسیری پوختەی قورئان)

ئەو بانگەشانەی دەربارەی هامان کراون لەسەر موحەمەد وەڵێن لە کتێبی پیرۆز وەری گرتوە تێکەڵی کردوە. هامانێك لە کتێبی موقەدەس هەیە لە کتێبی ئیشەرئەویش کتابێکە پرسرسیارێکی زۆری لەسەرە لە بارەی ڕاستیێتی کتێبەکە. هامانی لە تاتێکی دوورتری داناوە لە وڵاتی فارس وەك وەزیرێک لە کۆشکی ئەحسوریەس. بەهەرحاڵ هیچ سەرچاوەیەکی سەربخۆ نیە بڵێت هامان لە وڵاتی فارس بوە. هەندێكك لە زانا تەوراتیەکان دەڵێن هاممان خواوەندێکی عیلامیەکان بوە لە ئێران ٢٨٠٠ بۆ ٥٠٠ ساڵ پ.ز، یان ڕەنگە هەمایونی فارسی فرسی بوبێت، ناوە فرسیەکەی ئۆوایس.

ئێمە بە پێچەوانەی بەنگەشە گاڵتاویەکانی مەسیحیە مشتومڕکەرەکان دەڵێین هامان لە مەصری کۆن بوە.

د. مۆریس بۆکای یەکێك لوە کەسانەی لە ناوی هامانی کۆڵیوەتەوە لە ڕووی شوێنەوارناسی مصریەوە، کاتێك بینی لە قورئان ناوی هامان لە لەسەردەمی موسا هاتوە، زانی کە باشترین ڕێگا ئەوەیە پرسیار لە پسپۆڕێکی زمانی مەصری کۆن بکرێ وەك هیرۆغلافی لە بارەی

ناوی هامانەوە. بۆکای گفت و گۆیەکی خۆش لەگەڵ فەڕەنسیەکی شوێنەوارناسی مصرِ دەگێڕێڕێتەوە:

`` لە کتێبی لێکدانەوە لەسەر قورئان گێڕاومەتەوە ئەنجامی ئەو ڕاوێژکردنەی بۆ پێش دە دوازەدە ساڵ کردم، وای لێکردم پرسیار لە پسپۆڕێك بکەم سەرەڕای ئەوەش شارەزای زمانی عەرەبی کۆنشبێت. جا فەڕەنسیەکی دیاری شوێنەوارناسی مەصرِ ئەو مەرجانەی تێدابوون بەس بوو بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکە.

وشەی هامانم پیشان دا هەروەك چۆن لە قورئان نوسرابوو، وە پێم گوت لە سەدەی ٧ زانیەوە ئەوە لە ناو نوسراوێك دەرهاتوە، وە ڕستەکەش لەگەڵ کەسێك بەستراوەتەوە کە پەیوەندی بە مەصرِی کۆنەوە هەیە.

ئەویش پێی گوتم، لە حاڵەتی ئاوا تەماشای وەرگێڕانی مانای وشەکە ئەکات لە زمانی هیرۆگرافیەوە، بەڵام بۆ ئەو بە بێ گومانی وە ناکرێت دەقێکی نوسراو لەسەدەی ٧ زانیەوە ناوێکی هیرۆگرافی تێدابێت، کە لەو کات زمانی هیرۆگرافی بەتەواوی نەناسراو بوو وە بە تەواوی بیر چبوەوە، بۆ دەرخستنی وشەکە ئامۆژگاری کردم بەوەی بگەڕێمەوە بۆ فەرهەنگی ناوی تایبەتی شانشینی نوێ(( dictionary of personal names of the new kingdom by Ranke)) کە ڕەنگە ناوەکەی بە نوسراوی هرۆگرافی تێدا بدۆزیتەوە کە بەر لە من نوسویەتی وە رەرگێرانەکەش بە زمانی ئەڵمانیە.

هەموو ئەوەی پێویستم بوو لە لای پسپۆڕەکە دۆزیمەوە. سەرم سوڕما کاتێك پیشەی هامانم خوێندوە: سەرۆکی کارەکەرەکانی کانیە بەردەینەکان. وەک ئەوەی لە قورئان دەریان هێنابێت، هەرچەندە لە قورئان لەسەر زاری فیرعەون بە وەستای بینا ناوی هاتوە.

هاتێك هاتمەوە بۆ لای پسپۆڕەکە لەگەڵ وێنەیەکی لاپەڕەی فەرهەنگەکە دەربارەی هامان وە لاپەڕەکی قورئانیشم پیشان دا کە بتوانێت ناوەکەی تێدا بخوێنێتەوە، ئەو بێ دەنگ بوو.

ڕانك (نووسەری فەرهەنگەکە) لە تێبینی سەرچاوەی کتێبەکەی نوسیوە کە لە ساڵی ١٩٠٦ چاپ کراوە لە لایەن شوێنەوارناسی مەصرِ واڵتەر ڕێزینسکی: باسی وشەی هامان دەکات دەڵێت لەسەر تاتە بەردێك هەڵکەندرابوو لە مەتحەفی هۆف لە ڤیێنا هەڵگیراوە. دوای چەند ساڵێك کە فێربووم و توانیم نوسراوی هیرۆگرافی سەر تاشە بەردەکان بخوێنمەوە، سەرنجم دا وشەیەك لەگەڵ ناوی هامان هاتوە جەخت لەسەر نزیکی و گرنگی هامان دەکات لە لای فیرعەون.

جا من بەوە دەڵێم ئاستی زانیاری سەرسامکەر.

موحەمەد لە کوێ ئەو زانیاریەی دەست کەوتوە ئەگەر خوا نەبێت؟

هێشتا ماوە.

تەنها بیر لە ئاستی زانیاری یان ئاستی نەزانینی بەربڵاوی ١٤٠٠ ساڵ بەر لەئێستا بەکەوە. بەتایبەتی دەربارەی سروشتی دونیا. بە دڵنیاییەوە هەندێ بیرمەند و فەیلەسوووف شتی سەرسوڕهێنەریان دۆزیوەتەوە. هەتا خەملاندنی چێوەی بازنەیی زەوی، بەڵام زۆر شتی هەڵەشیان هەیە. داستان و ئەفسانەش گەلێك زۆر بوون دەربارەی درستکردنی گەردوون و سروشتی دونیا. بەڵێ موعجیزەش هەبوون لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ بەرز کردنەوەی باوەڕی باوەڕدار وە زاڵبوون بەسەر کەلە ڕەقی، بەڵام بە پێچەوانەوە وەسفکردنی دونیاو گەردوون سەنجراكێشانە هاوچەرخە. رەنگە لە قورئانەوە چاوەڕێی بەرپەرچدانەوەی ئەفسانەو داستانەکانی ئەو بکەی.تەنانەت ئەگەر موحەمەد باشترین بیرۆکەکانی ئەو سەدەمی وەرگرتوە وە ئەفسانەکانیشی وەلا ناون، بەڵام هێشتا هەژمار ناکرێت لەگەڵ سەرجراكێشی پایەداری و سازگاری قورئان لەگەڵ زانستی نوێ.

ئەم چەند ئایەتە خوارەوە باس لە گەردوون و دروسکردنی دەکات.

(( أَوَ لَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ)) (Al-Anbiyaa :30)

ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ئەوانە بێ بڕوا بوون کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوو (یەك پارچە بوون) ئینجا لە یەکترمان جیاکردنەوە وە فەراهەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن ؟.(تەفسیری پوختەی قورئان)

ئایا گوێبیستی بیگ بانگ بووی کە گەردوون چۆن لە خاڵێکەوە دەستی پێ کردوە، خاڵی چڕبوونەوەی ماددەو هێز؟ بە بیرتە لە پێشتر باسی ئەوەمان کردوە؟ زانیاریێەك کە لە قورئان باسکراوە زۆر ڕاست و تەواوە لەگەڵ شتێك تەنها ٧٠ ساڵ بەر لە ئێستا دۆزراوەتەوە. ئەی دەربارەی ئەمە چی دەڵێی:

وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ (Adh-Dhaariyat :47)

ئێمە بەهێزو توانای خۆمان ئاسمانمان بنیاتناوەو بەردەوام ڕووبەرەکەیشی فراوانتر دەکەین... (تەفسیری گوڵشەن)

له كاتێك ئەنشتاين بانگەشەی بیردۆزەكەی خۆی دەكرد، تێكڕای زانایان بڕاوایان وابوو كە گەردوون جێگیرەو وە بۆ هەتاهەتیە بە جێگیری دەمێنێتەوە، بەڵام تیبینیەكی نوێ لەسەر گەردوون ئەمەی ڕوون كردەوە كە ئاوا نیەو بەڵكو گەلەستێرەكان بە ڕێژەیەكی بەردەوام لە یەكتر دوور ئەكەونەوە، بە ڕوونتر گەردوون فراوان دەبێت. لە سەیر سەیرتر ئەوەیە چۆن شتی ئاوا لە كتێبێكی ١٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا دا هەیە؟

زانست هاوڕێیەكی دەمدمیەو لە گۆڕاندایە، كۆمەڵە شتێك كە زانایەكان لە سەردەمێك لە سەری كۆك بوون بەڵام لەسەردەمێكی تر بە پێچەوانەبۆتەوە بە هۆی تێڕامانی زیاتر. ئەمە باشترین هۆكار نیە حوكمی كتابێكی پێ بدەین. هێشتا هەندێ شت هەن با ڕادەیەك تێبین كراون كە بوونتە ڕاستی زانستی.

یەكێك لەوانە گەشەی كۆرپەلەی مرۆڤە. بیرۆكەی لێكۆڵینەوەی هەموو قۆناغەكانی كۆرپەلەزانی زۆر نوێیە. زۆر لە بیردۆزە كۆن و نوێیەكانی سەردەم ئەمڕۆ بە پووچ و بێ نرخ تەماشا دەكرێن. بۆ نموونە یەكێك لە بیردۆزە زاڵەڵ و باوەكانی سەدەی هەژدەمین بیردۆزی **پریفۆڕمەیشن** (نظرية التكون المسبق) بوو. ئەو بیردۆزە دەڵێ ئاژەڵەكان پێشووتر لە ناو سپێرمەكان دروست بوون هەروەها دەیانگت لە ڕێی تێڕامانەوە بۆیان دەركەوتوە لە ڕێگەی مایكڕۆسكۆبی سەرەتایی لەو كای هەبوون. زۆرتەماشا كردنی باوەركردنە پێی! ئەرستۆ وای بیردەكردەوە سوڕی مانگانەی ئافرەت لەگەڵ تۆو دەمەیێ بۆ پێكهێنانی كۆرپەلە . بەر لە سەدەی نۆزدە ئەم بیرۆكانە بە پووچو بێ نرخ دانەدەنران وە ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە ئەیزانین بە ئاشكرایی ڕوون نەكرابۆوە. جا قورئان بەر لە ١٤٠٠ ساڵ باسی قۆنەغەكانی كۆرپەلەی كردوە:

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ
﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا
فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ
﴿١٤﴾

(( المومنون١٢-١٤)

سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەكی پێكهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە. لەوەو دوا لە جێگەیەكی پارێزراوو لە باردا (كە منداڵانی دایكە) لە شێوەی نوتفەیەكی زۆر بچووكدا

داما‌ن مەزراندووە.   لەوەو دوا نوتفەكەمان كردووە بە خۆ هەڵواسەرێك (سەرە مێكوتەیەك) پاشان خۆهەڵواسەرەكەمان كردووە بە گۆشتپارەیەك، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەكەمان بە پەیكەری ئێسك گۆڕیوەو بە گۆشت پەیكەری ئێسكەكەمان داپۆشیوە، ئەوساله شێوەیەكی تردا دەرمان هێناوە (كە شێوەی ئادەمیزادێكی ڕێكو پێكە و ڕۆحی پێ بەخشراوە)، بە ڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەكەو چاكترین بەدیهێنەرو چاكترین دروستكارە.
( لە زمانی عەرەبی علق بە مانای كڵوە خوێن و بەمانای هەڵواسراو  وە  بە مانای زێروش دێت، جا لێرە هەرسێ ماناكەی تەواوەو بۆ ئەو قۆناغەی كۆرپەمە هەم كڵوە خوێنە هەم وەك زێروش هەڵواسراوە.)
(( يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِى رَيۡبٍ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٍ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٍ ...ۖ)) (Al-Hajj :5)

ئەی خەڵكینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندوو بوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن كە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستكردووە، لەوەودوا (نەوەكان) لە نوتفەیەك (پەیدا بوون)، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەكی تەواوو سەرو سیمادار، یان ناتەواو.....
كیث موور پرۆفیسۆر و سەرۆكی بەشی توێكارزانیە لە زانكۆی تۆرۆنتۆ لە كەنەدا، وە نووسەری كتێبی گەشەی مرۆڤە، وە بە یەكێك لە ڕابەرەكانی كۆرپەلەزانی دادەنرێت. لەبارەی فەرمایشتەكانی قورئان و حەدیسی صەحیح دەڵێت: تا سەدەی نۆزدە هەموو شتێك نەزانرابوو لەبارەی پۆلێنكردنی قۆناغەكانی گەشەی مرۆڤ. سیستەمی قۆناغەكانی كۆرپەلە لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدە گەشەی پێدرا،وە لە سەدەینۆزدە قۆناغەكان بە پیتەكانی ئەلفابێت ناونرابوون. لە سەدەی بیست ژمارە بەكارهێنران بۆ دیاریكردنی قۆناغەكانی گەشەی كۆرپەلە. بەڵام سیستەمی ژمارە دانان بۆ پەیڕەوكردن ئاسان نەبوو. سیستەمێكی باش بۆ پەیڕەوكردن سیستەمی وشەسازیە. لەو ساڵانە بە خوێندنی قورئان بنچینەیەكی نوێی پۆلێنكردنی قۆناغەكانی گەشەی كۆرپەلە  دەركەوت، بە تێگەیشتنێكی ئاسان بە پێی كردار و گۆڕانكاری شێوەی كۆرپەلە پۆلێنكراوە. ئەو دەستەواژانەی بەكارهێنراون لە خواوە بۆ پێغەمبەر موحەمەد نێردراون لە لایەن جبریلەوە. وە لە موصحەفی قورئان نوسراوەتەوە.... بۆ من ڕوونە ئەو فەرمایشتانە لە خواوە بۆ موحەمەد نێردروان. لەبەرئەوی ئەو زانیاریانە هیچی نەدۆزرابوەوە هەتا سەدەی نۆزدە. ئەوەش بۆ من ئەوە دەسەلمێنێ كە دەبێ موحەمەد نێردراوی خوابێت" مارشال جۆنسۆن پرۆفۆسۆر و سەرۆكبەشی توێكاری، وە بەڕێوبەری پەیمانگای توێكارزانی دانییێل بۆو لە زانكۆی تۆماس جێفەرسۆن لە فیلادلفیا دەڵێ: "وەك زانایەك من تەنها دەتوانم ئیش لەگەڵ ئەو شتانە بكەم كە  بە وردی دەیان بینم. وە لە كۆرپەلەزانی و گەشەی

زیندەوەرزانی تێدەگەم؛ وە لەو وشانەش تێدەگەم کە لە قورئام بۆیان وەرگێڕاوم. ئەگەر شوێن و کاتی خۆم گۆڕیبا بۆ ئەو سەردەم وە ئەوەی ئەمڕۆ ئەیزانم وە ئەو شتانەی ڕوونیان ئەکەمەوە بمزانیبا بمکردبا ، نەمئەتوانی شتەکان ئاوا ڕوون بکەمەوە وەک ئەوەی لە قورئان روون کراوەتە. هیچ بەڵگەیەکم نیە کە ئەو تاکە کەسە ئەو زانستەی لە شوێنێکی ترەوە وە گرتبێت و پەرەیپێدابێت، جا هیچ دژایەتیەك نابینم لەگەڵ بیرۆکەی دەستێخستنی خوایی و بەشداری خوا لە وەی کە ئەو توانیویەتی بیڵێ."

فەرمایشتێکی تری سەرنج ڕاکێش کە لە قورئان دۆزراوەتەوە دەربارەی چیاکانە:

أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا ٦ وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ٧

ئاخۆ زەویمان بۆ ڕانەخستوون ؟ .وە کێوەکانمان نەگێڕاوە بە مێخ ؟!
ئەمڕۆ هەموومان دەزانین کە چیاکان ڕەگی قوڵیان هەیە لە ژێرەوەی رووی ئەرزیان، وە ئەو ڕەگانە بەرزیەکەیان چەند جار بەرزترن لە ڕووی سەر ئەرز. جا بە پێی ئەم زانیاریە شیاورتن وشە بۆ وەسفکردنی چیاکان وشەی 'مێخە' کاتێك میخێك دادەکوتین بە تەواوی بە ڕێکی ئەوا زۆرینەی میێخەکە لە ژێر زەوی بزردەبێ. بیردۆزی هەبوونی ڕەگی قووڵی چیاکان لە نیوەی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە ناسێندرا.وە هەروەها چیاکان دەورێکی کارا دەگێڕن لە توندکردنی سەر ڕووی زەوی. ڕێگری لە لەرزینی زەوی دەکەن.

((وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ))
(An-Nahl :15)

وە (خوا) لە زەوی دا چەند شاخێکی دامەزراوی داناوە بۆ ئەوەی تاسەو لەنگەرتان پێ نەکات وە چەم و ڕووباری (تیا داناوە) هەروەها ڕێگای زۆر (ی بەدی هێناوە) بۆ ئەوەی ئێوە ڕێ ی پێ دەرکەن. (تەفسیری پوختەی قورئان)

وە هەروەها بیردۆزی نوێ **پلێیت تێکتۆنیك** لەسەر پێکهاتەی زەویە، وە بە پێی ئەو بیردۆزە چیاکان وەك جێگیرکەرێك بۆ زەوی کاردەکەن. ئەم زانیاریە دەربارەی ڕۆڵی چیاکان وەك توندکەری زەوی لە چوارچێوەی بیردۆزی **پلێیت تێکتۆنیك** بەم دواییانە لە ساڵی ١٩٦٠ لەسەری ڕێك کەوتوون .

لە قورئان ئاماژەی بە زۆر شت کردوە لە بارەی سروشتی دونیا، وە داوامان لێ دەکات بە قوڵی بیری لێبکەینەوە، وە ئەوانەی بە تێگەیشتوون درك بەوە دەکەن کە ئەمانە بەڵگەن بۆ

نیشاندانی هێزو دانایی خوای پەروەردگار، کە ئەمە هەمووی ئەوە نیە لە پێناو هیچ بێت یان لەپێناو رابواردنبێت، بەڵکوو لە پێناو مەبەستیکی کاریگەر و گەورەیە.

قورئان بۆ گەیاندنی کتێبێکی زانستی نیە، بەڵکوو کتێبی نیشانەو بەڵگەکانە، ئەوە ئاسانە بۆ ئەوەی تێبگەین پەروەردگار چۆن لە بارەی بنچینەی گەردوون و قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە وە ئەوەی چیاکان ڕەگیان هەیە دەزانێت، بە ڵام لێدانەوەی ئەوەی موحەمەد توانیویەتی هەموو ئەو زانیاریانە لە قورئان بنوسێت. مەگەر قەبووڵی بانگەشەی پێغەمبەربوونی ئەو بکەین. وادیارە قەبوڵکردنی ئەمە هۆشمەندانەترین بڕیاری کەسێکی هۆشیار و ڕاستگۆیە.

# بەندی حەوتەم

# بیرو باوەڕی قورئان

بیرو باوەڕە بنەڕەتیاکانی قورئان چین؟

یەکەم شت قەبووڵی بکەین ئەوەیە خوا یەکە، کە بێهاوتایەو لە هیچ شتێك ناچێ، وە هیچ شتێك لەو ناچێ. خوا یەکەو بێ بە تەنیایە هێچ هاوتاو هاوبەشێکی نیە، وە ئێمە دەبێ پاڕانەوەو نوێژمان بۆ ئەو بێت و وە تەنها ئەو بپەرستین.

چۆنیەتی پەرستنی پەروردگار و ڕێنموییدران به زانستەکەی بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیەتی. قورئام پێمان ئەڵێ هەموو پێغەمبەرو نێردراوانی خوا بۆ مرڤەکان مرۆڤ بوون. لەبەررئەوەی ئەوان تەنها پەیامەکە ناگەیەنن بەڵکو ژیانی ئەوان نمونەیەکی کرداریە بۆ شوێنکەوتن و جێبەجێ کردن پەیامەکە. ئەمەش ماقوڵە ئەگەر مرۆڤێك بتوانێ بیکا ئەوا بە لایەنی کەم تیۆریانە هەموو خەڵك ئەتوانن بیکەن، وە بەپێی قورئان خوا هیچ شتێکمان داوا لێ ناکا کە پێمان نەکری. ئەگەر پێغەمبەرەکان فریشتەبان ئەوا بیانوی زۆرمان دەهێناوە، دەمان گوت ئێمە ناتوانین و ناکرێ وەك فریشتەکان بین، بۆ وان ئاسانە وەك فریشتە بن.

قورئان پێمانئەڵێ ژیان تاقیکردنەوەیە. هەر لەبەر ئەوەیە خۆشی و ناخۆشی، لەش ساغی و نەخۆشی، دەوڵەمەدی و فەقیری، باش و خراپ ، شەو و ڕۆژ، تاریکی و ڕووناکی هەیە. لە ڕێگای دژەکانە شتەکان دەناسین، چۆن باشە دەنرخێنین ئەگەر خراپە نەبینین، چەن جار لە ژیانمان تا نەخۆش نەکەوتوین بەهاو نرخی لەشس اغیمان نەزانینوەو بەبیرمان نەبوە؟ تاقیکردنەوەکە بەدواگەڕان و دۆزینەوەی ڕاستی دەربارەی خۆدی خۆمان. ئایا ڕاستیەکە قەبوڵدەکەین یان بەدوای هەوەس و ئارەزوی خۆمان دەکەوین؟ ئایا گوێڕایەڵێ پەروەردگارمان دەکەین یان لە فەرمانی دەردەچین؟ خودا ڕێنمونی و ویستی ئازدی پێ بەخشیوین. ئێمە دەبێ ئەقڵی خۆمان بەکاربێنین بۆ ئەوەی لە ڕێنمونی خوا بگەینو شوێنی بکەوین. ئەگەر هەڵەیك بکەین هەر دەبێ هەڵیش بکەین چونکە هەموومان مرۆڤین. هەرچەندەی بەدوای ڕێنمونی پەروەردگار بگەڕێین داوای لێ خۆشبون و وە ئەوەی لە توانامان دایە بیکەین بۆ گۆڕینی خۆمان بەرەو باشتر، پەروەردگار بەردەوان دەمانبوورێ. لە ڕاستی سنوری تێگەیشتن و درکپێکردنمان بە گەورەیی خوا کرۆکی ئیسلامە. جا بۆیە دەبێ مرۆڤەکان خۆیان ملکەچی خوا بکەن، وە ئەوەش واتای ئیسلامە.

هۆکاری بونمان و ئامانجی سەرکی ژیری و دیاری ئەقڵ بۆ تێگەیشتن و کردنی هەموو شتێکە بەڕێگایەك کە ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت. زانینی چۆنیەتی کردنی هەر کردارێك بە پێی ڕەزامەندی خوا لە ڕێگای ئەو هیدایەتەیە خوا بە ئێمەی بەخشیوە. تاکوو یارمەتیمان بدات بە سەرکەوتووترین شێوە بژین و لەسەری بەردەوام بین، پەروەردگار ڕێبازی ئیسلامی کردوە بە بنچینەی پێکهێنەری شێوازی ژیان بۆ دامەزراندن و ڕێکو پێکردنی پەرستن لە ژیانمان. ئەوە نیە خووا پێویسیتی بە پەرستنی ئێمەبێت، خوا بێ پێویستی وە بە تەواوی بێ نیازە. نەڵکوو ئێمە لەگەڵ ئەو پێویستیە دروستکراوین، هەروەك لاشەمان پیویستی بە خواردنە، بە هەمانشێوە ئەقڵ و ڕۆحیشمان پێویستیان بە یاد و پەرستنی خوایە.

بۆیە گرنگترینکردەوە کە مرۆڤی باوەڕدار ئەنجامیدات نوێژە، بە شێوازی تایبەت و لە کاتی تایبەت، بە درێژایی شەوو ڕۆژ. ئەنجامدانی نوێژەکان بە ڕێکوپێکی و بە دڵسۆزی و تێگەیشتنەوە کلیلی گۆڕینی دەروونمانە.

کۆڵکەو بنچینەیەکی تر خێرکردنە بەوانەی هەژارن و خاوەن پێویستین. یەکێك لە گرنگترین بنچینە زیندەوەکانی ژیان کە ڕەزامەندی خوای پێ بەدەست دێنین میرەبانی و یارمەتیدانی ئەوانی ترە.

بە دڵنیاییەوە ژیان بەو جۆرە پێویستی بە تێکۆشان و خۆداری و ئارمیە، بۆیە بەڕۆژۆ بوون هەمووکات بنچینەی سەرەکی ئاینەکان بوە، وە لە ئیسلامیش بە هەمان شێوە بەڕۆژوو بوونی منگی ڕەمەزان، نە خواردن و نە خواردنەوە و جیماع کردن لە ڕۆژ هەڵاتنەوە تاکوو خۆر ئاوابوون هۆکارێکی گرنگە بۆ خۆ دوورگرتن لە قسەو کرداری خراپ، لە کاتێکدا کرۆکی بە ڕۆژۆبوون خۆ دوورگرتنە لە شتی خراپ وە خۆ ڕاهێنانە لە سەر ئەو دوورگرتنە.

ڕاستی گوتن و درۆنەکردنو وبەجێهێنانی پەیمانەکان و دادپەرپەروەربوون لە هەموو کاتێك ئەگەر بە دژایەتی خۆت و خانەوادەی خۆشت بێت، لە تایبەتمەندیە بنچینەکانی مرۆڤی باوەڕدارن . ڕێزگرتن لە داك و باوك و باش بوون لەگەڵیان، بە تایبەتی کاتێك بەتەمەنن وە باشبوون لەگەڵ جیران وە فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە ئەمانە هەموویان ناوەڕۆك و بنچینەیچاکەکارین. ئەمانە بنچینە بنەڕەتیەکانی ئیسالم پێك دێنن و مرۆڤ بەوکردارانە دەبێتە موسوڵمان.

ژان کورتەو زوو دەڕوا بەم زوانە هەموومان دەمرین بەڵام مردن کۆتایی نیە.

بەوڕبوون بە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە یەکێك لە بنچینەکانی ئیمانە. ئەو ڕۆژەی خوا هەمووومان بە یەکەوە کۆدەکاتە پرسیاری هەموو شتێکمان لێ ئەکات کە کردوومانە. بە کێش و ئەندازەی زەڕەیەك لە کردەوە باش و خراپەکان زانراوە لای ئەو.

بۆ ئەوانەی ڕاستی ڕەتئەکەوە، بێ فەرمانی و یاخی بوون هەڵئەبژێرن سزایەکی بە ئێشیان بۆ ئامادەکراوە، خۆیان ئەم هەڵبژرادنەیان دیاری کردوە. ڕاستیان لە لا ڕوون بووە خۆ لەگێلیدانیان پسەنەدکرد جا چ قەدەرێکی تۆقێنەر چاوەڕێیان دەکات، ئاگری جەهەنەم کە خەڵکی تێدا دەبرژێنو دەسوتێنن هێشتا هەر نامرن، بۆ هەتا هەتایە ئازار دەکێشن.

ئەوانەی چاکەکاربوون و گوێڕایەڵی خوایان هەڵبژارد لەو پەڕی خۆشی و شادی لە بەهەشت ئەژین، نە ڕق و تووڕەیی و نە بەغیلی لێیە، تەنها ئاشتی وشادمانی، جەستەیی و ڕۆحی ، چ ماڵێکی جوانە.

ئەمە ئەو ڕاستیەیە پەروەردگار بانگی ئێمەی بۆ دەکات: بەهەشتەکەی ئەو. پابەندبوون بە ئیسلام مانای ئەوە نیە کە هیچ چێژ و زەحمەتیەك لە ژیان نەماوە. لە ڕاستی پەروەردگار پێمان ئەڵێ ئاوا بە بێ تاقیکردنەوەبەجێمان ناهێڵێ بڵێین باوەڕمان هێناو تەواو. شوێنکەوتنی ڕێنمونی خوا فێرمان ئەکات مامەڵە لەگەڵ ئەو تاقیکردنەوانە بکەین کە لە دوای ناخۆشی خۆشی دێت، سەرلێشێوان بەرەو تێگەیشتن لە ئێش و ئازارەوە بەرەو خۆشی، لە خەم و خەفەتەوە بەرەو شادی.

زانینی ئەمەو شوێنکەوتنی ئاشتی ڕاستەقینە بۆ دڵ دەهێنێ. بەم واتایە ئاشتی دێنێ ئاشیەك کە خاڵی نیە شەڕ، بەڵام ئاشتیەك کە قووڵ و قووڵترە.

## بەندی هەشتەم

گەشتەکە کۆتایی هات.

ئێمە لە کۆتایی گەشتەکە نزیك بوینەوە وە جێی مەبەستمان لێ دیارە، تەنها یەک شت ماوە بیکەین.

پەیوەستە بە کات تاکوو دەرگاکە بکەیتەوەو پەیامی ڕاست لە پەروەردگارەوە ڕێنمویی ژیانت بکا.

وەك پێشتر گوتم بەشە گرانەکە ئەوە نیە بە ئەقڵ لە شتەکان بگەین، بەڵکوو بەشە گرانەکە ئەوەیە دەرگاکە بکەیتەوەو پەیامی پەروەردگار بکەیتە ڕێنموونی ژیانت.

دەستپێبکە بە ئیخلاسێکی تەواوەوە کە ئەمە دەکەیت تەنها لەبەر ئەوەی ئەو پەروەردگارەی تۆی دروست کردوە ئەوەی لە تۆ دەوێت، دواتر جا بۆچی داوای یارمەتی ناکەیت، بەردوامبەو هەوڵبدە داوای یارمەتی پەروەردگاری هەموو شتەکان بکەیت،داوای یارمەتی تەنها لەو بکە، لە ڕێگای هیچ کەس و شتێك نا ڕاستەوخۆ داوا لە پەروەرگار بکە، دڵپاکانە لە دڵەوە داوای لێ بکە ڕێنموویت بکات و یارمەتیت بدات بۆ وەی شتی ڕاست و دروستەکە بکەیت.

ئەو دەگایەش کلیلی تایبەتی خۆی هەیە. ئەویش ((لا اله الا الله محمد رسول الله)) واتە هیچ پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله.

وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (Adh-Dhaariyat :56)

بێگومان من پەری و ئادەمیزاد م دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوەنەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن .(تەفسیری ئاسان)

وە پەرستن واتە گوێرایەڵی تەواوو ملکەچبوون و خۆشەویستی بۆ خوای پەروەردگار. پەرست تەنها نوێژ و ڕۆژیو حەج نیە بەڵکو هەر کردوەیەك بە پێی فەرمان خوا بێت و لە دڵەوە بۆ ئەو بێت ئەوا پەرستنە، کابرای تاجر ئەگەر پیشەکەی بە حەڵاڵی بکات و فێڵی تێ نەکات وە لەبەر خواشی بێت ئەوا بۆی بە پەرستن حیسابە ئەگەر چی بۆ بژێوی ژیانی خۆشی بێت، بە هەمان شێوە لە ژیانی ڕۆژانەشمان،بۆ نمونە ئەگەر کەسێك لەگەڵ خێزانی نوست بە ڕێگای شەرعی ئەوا بۆی بە عیبادەت حیسابە.

جا لەم دونیایە هەر کەسەو گوێڕایڵ و ملکەچی شتێکە یان زاتێکە وە شتێکی لە هەموو کەسێك خۆشتر ئەوێت. زۆر کەس هەیە گوێڕایەڵ و ملکەچی حەزو زەوق و نەفسی خۆیەتی، هەر شتێك نەفسی داوای لێبکات ئەوا دەکات بە بێگوێدانە سنورەکانی خوا. وە هەشە ملکەچی گۆمەڵگایە هەر شتێك کۆمەڵگا پێی خۆشبێت ئەوا دەیکات هەرشتێك کۆمەڵگاپێی ناخۆشبێت ئەوا نایکات بە هەمان شێوە بێ گوێدانە ویست و ئیرادەی خوا، وە هەشە گوێڕایەڵی کەسێکی ترە یاساو ڕێساو بەرنامەی کەسێکی تری هەڵبژاردوەو کردویەتیە دەستووری ژیانی وە ڕێساو بەرنامەی خوای وەلا ناوە...

خوا پەرستی ڕاستە قینە بیر و باوەڕو ڕێساو دەستووری ژیان و عیبادەت و پەرستشەکانی بە پێی قورئان بێت و لە قورئانەوە سەرچاوەی گربێت.